


# سەربردەی کوردەواری

## بەرگی یەکەم

**کۆکردنەوە و ئامادەکردنی**
**جەمال گردەسۆری**

**زنجیره کتێبی کەلەپوری**

**ئینستیوتی کەلەپوری کوردستان***

**ژماره ( 11 )**



**www.kurdish-music.org**

---

* ناونیشان : هەولێر / ژێر کتێبخانەی گشتی هەولێر / بەرامبەر وەزارەتی تەندروستی
تەلەفۆن : 2238301 – 2238302 – 2519558

ناوی کتێب: سەربردەی کوردەواری
کۆکردنەوەو ئامادەکردنی: جەمال گردەسۆری
پێداچوونەوەی: پ.د. شوکریە ڕەسول
دەرهێنانی هونەری: شنۆ خدر ڕەسول
دیزاینی بەرگ: سەیوان سەعیدیان
تایپ: جەلیل عەبدولواحید بۆتانی
هەڵەچن: بەناز عەلی
سەرپەرشتی چاپ: عیماد ڕەشید پیرداود
چاپ: چاپی یەکەم 2006/هەولێر
تیراژ: 1000 دانە
چاپخانەی کشتوکاڵ
لە کتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارەی سپاردنی (**789**) ساڵی 2006 دراوەتێ

## پێشکەشە:

- بە گیانی خوشکی گەورە و شەهید زبێدە ئیسماعیل، کە چەندین سەربردە لەسەر زاری ئەوتۆمار کراوە .
- سەرجەم هاوڕێیانی رەوسەی فۆلکلۆر .
- بەو خەمخۆرانەی خزمەت بە بواری فۆلکلۆری کوردیمان دەکەن بە کۆکردنەوە و لێکۆلینەوە .
- بە تۆش خوێنەری فۆلکلۆری کوردیمان .

# پێشەکی

## کەریم شارەزا

فۆلکلۆری هەر نەتەوەیەکی ئەم جیهانە کاڵای باڵای ژیانی ڕابردووی کۆمەڵانی خەڵکەکەیەتی و ئاوێنەیەکی باڵانمای دابونەریتی کۆمەڵایەتی رۆڵەکانی میللەتەکەیەتی و چەند لق و پۆپێکی سەرەکی لێ دەکەوێتەوە و لە هەموویان گرنگتر ئەدەبی فۆلکلۆرییە ئەویش دەکرێتە چەند بەشێکی گرنگ و سەرەکی وەك حیکایەت و سەربردەی کۆن و ئەفسانە و داستان و شیعر و پەندی پێشینان و مەتەڵ ...

لە فۆلکلۆری کوردیشدا ئەو لق و پۆپانە هەن و بە پێی ئەم بەرهەمە، تەنیا ئاوڕ لە ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی دەدەینەوە و لەو ئەدەبەش دەکەوینە سەر ئاوەڕدانەوە لە لقی سەربردەی کۆنی کوردەواری کە لقێکی زۆر گرنگە لە کەلەپووری نەتەوایەتیمان، چونکە هەر سەربردەیەك پەند و ئامۆژگارییەکی بە نرخمان پێدەدات و سودێکی باشی لێ وەردەگرین، یاخود ڕووداوی واقیعی لە ژیانی خەڵکە سادە و ساکارەکە و لە هەر ڕووداو و بەسەرهاتێك دەرسێك و ئەقڵێکیان لێ وەردەگرین و سودمەند دەبین .

لە دوو توێی ئەم کتێبەدا کاك جەمال گردەسۆری (100) سەربردەی کوردەواریی ناوەڕۆك پتەوی بۆ ئامادەکردووین و لە خوێندنەوەی هەر یەکێکیان پەند و ئامۆژگاری و دەرسێك وەردەگرین و لە ژیانی

سەردەمی جارانی کۆمەڵگای کورد دەگەین، کە چۆن ژیاون و ئەو خەڵکە چۆن هەڵس و کەوتیان لەگەڵ یەکتریدا کردووە و ئێمە چۆن بتوانین لەم سەردەمانەدا کەڵك و سوود لەو سەربردانەیان وەرگرین و پەیڕەوی لایەنە باشەکانیان بکەین و خۆمان لە لایەنە خراپ و سەلبیەکانی ئەو کۆنە ڕووداو و بەسەرهاتانەیان لابدەین، هەر ئەوەشە سوودی خوێندنی زانیاری فۆلکلۆری بە گشتی و حیکایەت و سەربردەی کوردەواری لەم سەردەمانەدا بە تایبەتی. ئیدی هیوادارم خوێنەری ئازیز بە وردی ئەم کۆمەڵە سەربردە کوردەوارییە بخوێنێتەوە، ئینجا حوکم لەسەر پتەوی و نرخ و بەهایان بدات .

هەولێر:. 2001/7/25

# چوار برا*

دەگێڕنەوە لە سەردەمی کۆن لەنێو کوردەواریدا، لە گوندێکدا چوار برا هەبوون، هەر چواریان خاوەن دەغڵ و دانێکی زۆر بوون، هەر چواریشیان بەیەکەوە دەژیان، لەگەڵ ئەوەشدا باوك و دایکیان نەمابوو، بەڵام هۆی بەردەوام بوونی ژیانیان بەیەکەوە ئەمە بوو، لەگەڵ یەکدا گەلێك پاك بوون و فرت و فێڵیان لەگەڵ یەکدا نەدەکرد، دەڵێن هەموو ساڵێك دەغڵ و دانیان لەسەر جۆخین روو دەکرد، مێرووستان لە دەغڵەکانی دەوروبەری ئەو چوار برایە، دەغڵیان دەکێشایە سەر قۆمەتە دەغلەکانی ئەو برایانە .

چەند ساڵ بەم شێوەیە بەردەوام بوو، تا هاوینەك دەبینن ئەم جارە مێرووستان دەغڵ لەسەر قۆمەتەکانی برایەکان دەکێشێتەوە بۆ قۆمەتە دەغڵی دیکە،برا گەورەکەیان بانگی برایەکانی کردو گوتی: هۆی ئەمە شتێك هەیە، دووانیان وتیان: بەخوا چیمان نەکردووە، ئەویتر گوتی: من ئەویَ ڕۆژیَ هێلکەم کڕی، کە سەیرم کرد چەند هێلکەیەك گەورەتر بوو، ئەوانم بۆ ماڵی خۆم دانا، برا گەورەکە گوتی: کەواتە هەر ئێستا ماڵەکە بکەینە چوار بەش و لەمەودوا هەر کەسەو بۆ خۆمان کاربکەین، هەر چەندە برایەکە گوتی: جارێکی دیکە شتی وا ناکەم، برا گەورە گوتی: تازە تەواو ماڵەکەیان کردە چوار بەش و لەیەك جیابوونەوە.

---

* لە ڕۆژنامەی برایەتی ژمارە/3131/ ڕۆژی 2000/7/11 بڵاوکراوەتەوە .

# تەماحکاری*

دەگێڕنــەوە لــە ســەردەمی کــۆن لــەنێو کوردەواریــدا، پــیرە پیــاوێکی بەساڵاچووی دەوڵەمەند، خاوەنی سەر و سامانێکی زۆری ماڵی دنیایێ، دەچێتە خوازبێنی کچێك، کچە لە سەرەتا ڕەزامەند نابێ، بەڵام دایك و باوکی کە تەماحکاری بەرچاوی گرتبوون دەچنە بن گوێی کچە و پێی دەڵێن نەکەی دەبەنگ بی، ڕەزامەند بە، ئەو فرسەتە لە کیس خۆت مەدە، ئەو پیرە پیاوە عومری پیرە مەڕێکی ماوە، بۆ خۆت دەبیتە خاوەنی سەر و سامانێکی زۆر کچە لە ڕێی ئەم تەماحکارییە ڕازی بوو، ساڵێك تێپەری نەمرد، تا سەر ئەنجام پیرەمێرد تەرمی هەرسێکیانی بەرێ کرد، کچە و دایك و باوکی کچە، پیرەمێرد هەر ساغڵم مایەوە.

* لە ڕۆژنامەی برایەتی ژمارە/3413/ ڕۆژی 2001/6/20 بڵاوکراوەتەوە .

# زۆرانبازێك*

دەگێرنەوە لەنێو کوردەواریدا زۆرانبازێك هەڵکەوتبوو، دانیشتوانی گوند بە بچووك و گەورەوە شانازیان پێوە دەکرد، لەبەر ئەوەی هێندە ژیر و بە توانا بوو هیچ زۆرانبازێك نەیدەتوانی خۆی لەقەرە بدات، ئەم زۆرانبازە لە گوند لاوێکی هەڵبژاردبوو مەشقی پێدەکرد، بە مەبەست شوێنی ئەو بگرێتەوە، چونکە ئەو بەرەو ساڵ دەچوو، ئاواتی هاتە دی و لاوەکە بوو بە زۆرانبازێك چەندان زۆرانباز ڕوو بە ڕووی بوونەوە، بە دۆڕاوی گەڕانەوە، زۆرانبازی لاو مەغروری گرتی و بە زۆرانبازەکەی گوت: بەسەر گشت زۆرانبازەکان سەرکەوتووم، دەمەوێ لەگەڵ تۆش بکەومە زۆرانبازی بۆ ئەوەی پلەی یەکەم بۆ خۆم بێت، زۆرانباز گوتی: چۆن قسەی وا دەکەی من مامۆستای تۆم و بە ساڵا کەوتووم، چەند ڕۆژەکم لە ژیان ماوە، بە پێکەنینەوە گوتی: یا دەبێ دەنگ هەڵبڕی و من بە پلەی یەکەم دابنێ، یان زۆرانبازی بکەین، ناچار زۆرانباز لێی هاتە مەیدان و بە ئاسانی بە فێڵێك سەرکەوت، زۆرانبازی لاو گوتی: بۆ ئەم فێڵەت پێ نەوتبووم لە مەشقا، زۆرانبازەکە گوتی: بۆ ئەوەی گەر مەغرور بووی مەغروریت بشکێنم .

---

*[1] لە ڕۆژنامەی برایەتی ژمارە/3045/ ڕۆژی 2000/6/7 بڵاوکراوەتەوە .

# تا بەیانی*

دەگێڕنەوە لە سەردەمی کۆن لە گوندێکدا، ئافرەتێك لە دوای نان خواردنی ئێوارە دەڕوا بۆ سەردانی ماڵێك، لە ڕێگا تووشی ئافرەتێك دەبێت کە ئەویش بۆ لای ماڵێك دەچێت، لەگەڵ ئافرەتەکە دەکەونە قسە کردن لەگەڵ یەکدا، تا ئەو کاتەی مەلا بەلایاندا دێت بۆ نوێژی بەیانی، کە مەلا ئەو دوو ئافرەتە دەبینێ دوای سڵاو کردن دەپرسێ ئەوە خێرە لێرە وەستاون، هەر یەك لە ئافرەتەکان دەڵێن دەمانەوێ ئەمڕۆ ئێوارە بە سەردان بچینە ماڵی فلان کەس، مەلاش دەڵێ: کەی کاتی سەردان ماوە من دەچم بانگی بەیانی دەدەم .

* لە گۆڤاری خەباتی قوتابیان ژمارە/58/ بڵاوکراوەتەوە، ئابی/2002 .

# حەلوا بخۆ*

دەگێرنەوە لەنێو خێڵانی گەرمیان و کوێستان بووك و زاوایەك لە یەكەم ڕۆژی چوونە ژێر پەردە زاوا كیسەیەك حەلوای دەهێنێ و بە بوك دەڵێ: فەرموو حەلوا بخۆ، بوكەكە دەڵێ: ئەی بەشی دایك و باوكت داوە؟! زاوا دەڵێ ئەوان گرنگ نین،لەبەر ئەم قسەیە، بوك بەڵێنی دا سوودی لێ نەبینێ، بە هەر چ جۆرێك بێت، بەكچێنی ماوە، بەیانی هەر كە ڕۆژهەڵات بەرەو ماڵی باوانی گەڕایەوە و تەڵاقی خۆی لە كابرا سەند، ماوەیەكی پێدەچێت بوكەكە شوو دەكات و حەوت كوڕی لە دوای یەك دەبێت، زاواش كچێكی دی دەهێنێ و دەبێتە خاوەنی چەندین كوڕ و كچ، پاش چەندین ساڵ ڕۆژێكیان خێڵ لە گەرمیان بەرەو كوێستان دەڕوا، ژنە بە سواری وڵاغێك بەڕێ دەكەوێ و هەر حەوت كوڕەكەشی لە دەوری دەڕۆن و لەرێگا تووشی كابرایەكی شڕو پێ پەتی لە دوای كاروان ڕایدەكرد و پێییەكانی هەڵدەكەوت، ژنەكە سەیری دەكا، دەبینی ئەو پیاوە كە تەلاقی لێسەندەوە، لەسەر وڵاغەكە دێتە خوارەوە و دەڵێتە كورێكی ئەم پیاوەیە بانگ بكەن، كوڕەكەش بانگی دەكا و كابرا دەهێت و دەڵێتە كابرای، فلان كەس چۆنی وەرە سواری وڵاغەكە ببە، بەم جۆرە كابرا سواری وڵاغەكە دەبێت و ئینجا دەڵێ: چۆن من دەناسی و منیش تۆ ناناسم، ژنە دەڵێ: ئەی حەلواكەت لەبیرنایە، كابرا دەگری. ژنە دەڵێ: مەگری ئاخر بۆیە من تەلاقی خۆم لەتۆ سەند، چونكە دەمزانی هاوسەری تۆ بام وەك تۆم بەسەر دەهات .

---

* لە ژمارە/1/ی گۆڤاری ئاسۆی فۆلكلۆر بڵاوكراوەتەوە .

# نسیب نەبوو*

دەگێڕنەوە مەلایەك لەگەل فەقێیەكانی زۆر تووڕە و توند دەبێت، بە مەبەستی ئەوەی لێی بترسن وانەكانیان بخوێنن، دەڵێن جارێكییان لە مانگی رەمەزان مەلا تازە دەرپێیەكی سپی و كەوێ و سەڵتەیەكی نوێی كڕی بوو لەبەری كردبوو لە ژووری تایبەتی خۆی دانیشتبوو چاوەڕوانی فتار بوو. مەسینەی قاوەش لەسەر مەقەرە دەبێت، لەكاتێكدا فەقێیەك بەولایە تێدەپەڕێ ئاگادار نابێت خۆی لە مەسینەی قاوەكە دەدات قاوە بەسەر دەرپێی سپی و كەوای نوێی مەلا دادەرژێن، فەقێ خەم دایدەگرێ و ئەو كات مردن بە پارە بێت دەیكڕی، بەلام مەلا پێدەكەنێ، دانیشتوەكان زۆر لایان سەیر دەبێ. بۆیە دەڵێن: مامۆستا تۆی هێندە تووڕە و توند لەگەڵ فەقێیەكان ئێستاش ئاوات بەسەرهات دەبینین پێدەكەنێ، مەلا دەڵێ: براینە ئەم قاوەیە نسیبی من نەدەبوو بیخۆمەوە بۆیە ڕژا، جا ئەگەر نسیب لە خواردنێك نەبێ ئەوە شتەك ڕوودەدا، گەر ئەو نەڕژایە دەبایە شتێك بەسەر من بهاتایە، تووڕە و توندی منیش بەرامبەر فەقێیەكان بۆ ئەوەیە دەمەوێ بخوێنن .

* لە ژمارە /1/ی گۆڤاری ئاسۆی فۆلكلۆر بلاوكراوەتەوە .

# بکوتین، یان بخۆین*

دەگێرنەوە لەنێو کوردەواریدا کابرایەك هەبوو، تا بڵێی دەوڵەمەند، چەندیش بڵێی ڕەزیل، جارێك ژنەکەی نەخۆش دەبیّ داوای گۆشت دەکات، ڕەزیل بە بۆڵە بۆڵ دەڵیّ: باشە دەچمە شار سەر و پێچکەك دەکڕم، دەچیّ بەڵام نرخەکەی لاگران دەبیّ ناکڕی، لە بۆ هەرزانتر دەچیتە چەند شارەکی دیکە، هەر ناکڕیّ نرخەکانی لا گران دەبیّ، لە دوا شار شەو مێوانیماڵێك دەبیّ، ژنەك و پیاوەك دەبن، کاتی نان خواردن خواردنەکی باش دەهێننە پێشی، جا ژنەکە بە مێردەکەی دەڵیّ: با بیکوتین ئینجا بخۆین، ڕەزیل بە ترسەوە مەبەستتان چییە؟ ژنە دەڵیّ: تۆ نان بخۆ، کە گەڕامەوە بۆت دەگێرمەوە، دەچنە ئەو دیو ماوەیەك دەست دەکەن بە کوتینی شتەك، دواتر دەگەڕێنەوە، ژنە دەڵیّ من کچەك بووم شووم بە کوڕێك کرد، زۆر دەوڵەمەند بوو، زۆریش ڕەزیل بوو، پاش ماوەیەك نەخۆش کەوت و مرد، منیش دوای ئەو شووم بەم کابرایە کردووە، گۆڕەکەی ئەویش لەم دیوییە، جا پێش نان خواردن گۆڕەکەی بە کوتك دەکوتین ئینجا نان دەخۆین، ڕەزیل ترسی کەوتە دڵی، بەیانی بە شتومەك و خواردنەکی زۆرە وە دەگەڕێتەوە ماڵ.

---

* لە ڕۆژنامەی برایەتی ژمارە/3030/ ڕۆژی 2000/2/15 بڵاوکراوەتەوە .

# نەمگوت*

دەگێڕنەوە لە سەردەمی کۆندا لە گوندێکدا ژنەك و پیاوەك هەبوون، پیاوەکە بەنیەتی کەر کڕین دەبێت، دەچێ ئاخوڕەکی گەورە دروست دەکات، ژنەکە دێتە لای ئاخوڕەکە دەڵێ: هێشتا کەرت نەکڕیە ئەم ئاخوڕەت بۆ چییە؟ پیاوەکە دەڵێ: ژنەکە بڕۆ گوریس و مێخزنجیرێکم بۆ بێنە با فێری کەر بەستنەوەت بکەم، ژنە دەچێ گوریس و مێخزنجیر بۆ پیاوەکەی دەینێ، پیاوەکە مێخزنجیرەکە دادەکوتێ و سەرێکی گوریسەکەی لێدەبەستێ و ئینجا دەڵێ: وەرە من ببەستەوە، ژنەش پیاوەکەی دەبەستێتەوە لە پاشان پیاوەکە دەڵێ: کە کەرم کڕی و هێنامەوە ئاوا بیبەستەوە، بەڵام ئاگاداری خۆت بە نەچیتە دواوەی کەر لوشکەی داویێ، ژنەکەش دەڵێ: باشە، لەم قسانە ژنە دەخافڵێ و دەچێتە دواوەی پیاوەکە، پیاوەکەش یەك لەقەی لە ژنەکەی دەدات، ژنە دەکەوێت، پیاوەکە بە هاوارکارکردن بە ژنەکەی دەڵێ: نەمگوت نەچیتە دواوەی کەرەکە لوشکەت لێدەدات !!

---

* لە گۆڤاری خەباتی قوتابیان ژمارە/58/ بڵاوکراوەتەوە .

# خەڵات*

دەگێڕنەوە لە سەردەمی کۆندا لەنێو کوردەواریدا پاشایەکی ئاقڵمەند کوڕێکی 5 ــ 6 ساڵانی هەبوو، هەموو شەوێك ئەم کوڕەی ئامۆژگاری دەکرد بۆ ئەوەی لە پاشەڕۆژدا لەبەری بحەسێتەوە، دەڵێن ڕۆژێك کوڕەکەی بزر دەکات، پاشا بانگەواز دەکات هەر کەسێکی کوڕەکەی دۆزیوەتەوە ئێستا بۆی بگەڕێنێتەوە 1000 لیرەی پێ دەبەخشێ، ئەو کەسەی کە کوڕەکەی دۆزیوەتەوە خەیاڵی ئەوە دەکات، ئێستا بیگەڕێنیتەوە 1000 لیرە وەردەگرێ، گەر بەیانی بیگەڕێنیتەوە لەوانەیە بیکاتە 2000 لیرە، بۆیە شەو کوڕە لای خۆی دەهێڵێتەوە و خزمەتێکی باشی دەکات، بۆ بەیانی گوێبیستی هیچ بانگەوازێك نابێت ناچار دەستی کوڕە دەگرێت و دەیباتەوە لای پاشا، دوای کەمێك وەستان داوای خەڵاتەکەی دەکات، پاشا دەڵێ: خەڵاتی چی؟ ئەو خەڵاتەم بۆ ئەوە تەرخان کردبوو بۆ ئەوەی ئەمشەو لە ئامۆژگارییەکانم بێبەش نەبێت .

---

* لە ڕۆژنامەی پاڵە ژمارە/70/ ڕۆژی 2002/10/22 بڵاوکراوەتەوە .

# هەر دەمكوژی*

لە كوردەواریدا دەگێڕنەوە دوو كەس بە شەڕ هاتوونە، یەكێك ئەوی دیكەی لەبنەخۆی ناوە لەگەڵ ئەمەشدا دەگریێ، یەكێكی تر كە بۆ لەیەك كردنەوە دەچێتە لایان و بەم جۆرە دەیانبینێ و دەڵێتە ئەوی لەسەرەوەیە تۆ لەسەرەوەی بۆ دەگریێی، ئەویش دەڵێ: تۆ نازانی گەر هەڵبستێتەوە هەر دەمكوژێ .

# زمان بەرای سەرە*

دەگێڕنەوە، كابرایەك لە گوندێك بۆ شار دەچێ لەڕێگادا تووشی سەری مرۆڤێك دەبێ، سەرەكە بەدەنگێكی بەرز هاواری دەكرد زمان بەرای سەرە، كابرا بەم قسەیە سەری سوڕ دەمێنێ و بە پڕە پڕ دەڕوا دەچێتەوە گوندی و زمانی خۆی پێ ڕاناگیرێ و دەچێتە لای ئاغای گوندی و دەگێڕتەوە، ئاغا بڕوای پێ نایێ، بۆیە دەڵێتە كابرای وا دەچمە شوێنەكەی درۆ بێ دەتكوژم، كابرا دەڵێ: باشە، كە دەچێ دەبینی سەرە بێ لاشەكەی لێیە بەڵام هیچ قسان ناكات، بۆیە ئاغا لەوێ لەسەری كابرا دەدات، لەپاشان سەرەكە دێتە وەڵام و دەڵێ: ئەدی نەمگوت زمان بەرای سەرە .

---

* لە ڕۆژنامەی پاڵە ژمارە/70/ بڵاوكراوەتەوە .

* لە ڕۆژنامەی پاڵە ژمارە/79/ ڕۆژی 2004/2/25 بڵاوكراوەتەوە .

# کابرایەکی قسە گەورە*

دەگێڕنەوە لە سەردەمی کۆن لەنێو کوردەواریدا، کابرایەك دەبێ، قسە گەورە و لە کردار بێسوود، شەوێك لە شەوانی زستان لەگەڵ ماڵ و منداڵەکەی دانیشتیە، کابرا ڕوو لە منداڵەکانی دەکا و دەڵێ: ئەمساڵ فلان پارچە زەوی دەکەم بە گندۆرەی دێمی، دەزانم بیستانەکەی باش دەبێ و هەر گندۆرەکی لە دوو سێ کیلۆ کەمتر نابێ، ئەوجا گندۆرەکان دەفرۆشم و چەند مەڕەکی پێ دەکڕم، دوای چەند ساڵەکی دیکە، مەڕەکان زۆر دەبی و دەچینە ڕەشماران ڕوو لە بوکی گەورە دەکا و دەڵێ: تۆش ببە بە بنەوانمان، بوکەش دەڵێ: من نایەم با بوکی بچووك بێ، ئەویش دەڵێ من ناچم تۆ بڕۆ، بەم جۆرە قسەیان یەك ناگرێ و دەبێتە شەڕیان ئەنجام شەڕەکە دەکەوێتە نێوان کوڕەکانیشی، لە ئاژاوەی شەڕ جیرانەکان بە ئاگادێن و دێنە نێوانیان و لەیەکیان دوور دەخەنەوە بۆ ئامۆژگاری پێیان دەڵێن: براینە شەڕ، شەرمە، بۆ شەڕ دەکەن، برای یەکن باوکەکەیان بەسەرهاتەکەیان بۆ دەگێڕێتەوە و جیرانەکانیش ڕوو لە کابرا دەکەن و تێر پێدەکەنن .

---

* لە ڕۆژنامەی برایەتی ژمارە/3025/ ڕۆژی 2000/2/8 بڵاوکراوەتەوە .

# پیاو لە ژنی خۆی بترسیٚ بە مردوو حیسابە*

لە کوردەوارییدا دەگێڕنەوە دەڵێن، جارێکیان لە کوندەبۆیان پرسییە مرۆڤ مردووی زیاترە، یان زیندوو، کوندەبۆش گوتیەتی: مردوو، گوتیان چۆن وا دەڵێی زیندوو زێترە، کوندەبۆش گوتیەتی: ئەو پیاوەی لە ژنی خۆشی بترسیٚ بە مردووم حیساب کردووە .

# بەندە*

دەگێڕنەوە لە سەردەمی کۆن لەنێو کوردەواریدا، جارێکیان پاشایەك یەکێك بە شایەد دادەنیٚ لە دادگا، دادوەریش(حاکم) قبولی ناکات، پاشا زۆر لە دادوەرەکە تورە دەبیٚ و بە تورەییەوە دەڵیٚ: کو دەبی قبولی نەکەی، دادوەر دەڵیٚ: لەبەر ئەوەی بەگوێی خۆم گوێم لیٚ بوو، کابرا بەتۆی گوت من بەندەی تۆم، واتە عەبدی تۆ، عەبدیش بەشایەد ناچێت، پاشا ناچار بوو قسەی حاکم قبولٚ بکا و بێدەنگ بێت .

---

* لە ڕۆژنامەی پاڵە ژمارە/70/بڵاوکراوەتەوە .
* لە ڕۆژنامەی پاڵە ژمارە/70/ڕۆژی 2004/5/25 بڵاوکراوەتەوە .

# وەزیرێکی ئاقڵمەند*

دەگێڕنـەوە لـە سـەردەمی کـۆن لـەنێو کوردەواریـدا پاشـایەك هـەبوو، وەزیرێکـی ئاقڵمەنـدی هـەبوو، شـەوێك وەزیـر خـەونێك دەبـینێ، لـە خەونەکەدا بارانێك دەبارێت، هەر کەسێك ئاوی بارانەکە بخواتەوە شێت دەبێت، بۆ بەیانی وەزیر دەچێتە لای پاشا و دەڵێ: پاشام خۆش بی، خـەونم دیـوە، ئـەمرۆ بارانێـك دەبارێـت، هـەر کەسـێك ئـاوی بارانەکـە بخواتـەوە شـێت دەبێـت. جـا پاشـا دەڵـێ: کەواتـە ئـاوی بارانەکـە ناخۆینـەوە، بـاران دەبـارێ وەزیـر جامـە ئاوێـك لـە ئـاوی بارانەکـە هەڵدەگرێ، خەڵکی شاریش سەرتاپای ئاوەکە دەخۆنەوە و سەرجەمیان شێت دەبن، تەنیا وەزیر و پاشا نەبێت، بۆ بەیانی پاشا دەڵێتە وەزیر، بابچینە ناو بازاڕ بزانین وەزعی خەڵکەکە چۆنە، بەیەکەوە دەڕۆن وەزیر جامە ئاوەکـە لەگـەڵ خـۆی دەبـات، کـە دەگەنـە نـاو بـازار خەڵکەکـە لـە دەوریـان کۆدەبنـەوە و دەڵێن، پاشا و وەزیر شێت بوونە، پاشا دەڵێتە وەزیر چارەمان چییە؟

خەڵکەکە بەشێتمان تێدەگەن، وەزیر دەڵێ: قوربان چارەی ئاسانە، مـن جامـە ئـاوێکی بـارانم هـەڵگرتووە، ئێمـەش دەیخۆینـەوە جـا هەردووکیان کە ئاوەکەیان خواردەوە چوونەوە نێو خەڵکەکە بەم جۆرە خەڵکەکەش لێیان دوورکەوتنەوە و وازیان لێهێنان .

* لە ڕۆژنامەی برایەتی ژمارە/3204/ ڕۆژی 2000/10/10 بڵاوکراوەتەوە.

# من کوڕی ئەوم*

دەگێڕنەوە لەنێو کوردەواریدا، گەنجێك کە تازە ژنی هێنابوو، بەهۆی ناکۆکییەك لەگەڵ برادەرێکی خۆیدا دەبێتە شەڕ و گێچەڵیان، برادەرەکەی بەردێکی بۆ ڕادەوەشێنێ لە دەرئەنجامدا دەبێتە مایەی ئەجەل پێ هاتنی، بۆیە کابرا باروبارگەی خۆی تێك دەنێ و گوندەکە بەجێ دێڵێ، دوای چەند ڕۆژێك خێزانی گەنجەکە کوڕێکی دەبێ دوای چەندین ساڵ بەسەرهاتی باوکی بۆ دەگێڕنەوە، کوڕە بە دوای تۆڵە سەندنەوەی خۆیدا دەگەڕێت، شەوێك لە شەوان میوانی ماڵێك دەبێ، دوای خزمەتێکی زۆر تا کاتی خەوتن، ئینجا نوێنی خەوتنی بۆ دەهێنن و کابرا خۆشی دەچێتە نێو تەندوور، کوڕە ئەم دیمەنەی زۆر لاسەیر دەبێ، بۆیە لەنهێنی ئەم کارە دەپرسێ، کابراش تەواو بەسەرهاتەکەی خۆی بۆ دەگێڕێتەوە، کوڕەش دەڵێ: وەرە دەرەوە من کوڕی ئەوم لێت خۆش بووم، پیاوەکەش کچێکی گەنجی دەبێت بە کوڕەی دەبەخشی، بەم جۆرە بەیەکەوە دەگەڕێنەوە گوندەکەی خۆیان .

---

* لە ڕۆژنامەی برایەتی ژمارە/3040/ ڕۆژی 2000/2/29 بلاوکراوەتەوە .

# کەس نەبوو بیشارتەوە*

لەسەردەمی کۆن لە کوردەواریدا دەگێڕنەوە، پاشای شارێك لـە پێش کۆچکردنی گوێدرێژەکەی دەتۆپێ، سـەرجەم دانیـشتوانی شـار لـە دوای کەلاکەکەی دەڕۆن، ساڵی دواتر کە پاشا کۆچی دوایـی کـرد کـەس نـەبوو بیشارتەوە .

# مەزهەب*

دەگێرنەوە لە سەردەمی کۆن، ڕۆژێکیان کابرایەکی کەم ئەقل دەچێتە لای مەلایەك دەڵـێ: مامۆسـتا داخـوا ژنـێکم لـۆ نابینیـەوە، ئـەویش دەڵـێ: باشـە، بـەس ئـەمن هەنـدەك پرسـیارت لێدەکەم ئەگـەر زانیـت چیـت دەوێ لـۆت جێبـەجێ دەکـەم، کـابرا دەڵـێ: باشـە، مـەلا لێـی دەپرسـێ ئیـسلام چەند مەزهەبی هەیە، کابرای گێل دەڵـێ: حـەوت، مـەلا لێـی تـوڕە دەبـێ و ڕووی گـرژ دەکـا، کابرایـەك لـە تەنیـشت کـابرای دەبێـت بـە دزیـەوە پێـی دەڵێ: کوڕە نەگبـەت بـرێ چـوار، کـابرای گێـل دەڵـێ: هـەئهو ئـەتو دەڵێـی چی، مامۆستا بە حەوتان ڕازی نابێت کوو بە چواری ڕازی دەبی .

---

* لە ڕۆژنامەی پاڵە ژمارە/70/بڵاوکراوەتەوە .

* لە ڕۆژنامەی پاڵە ژمارە/82/ ڕۆژی 2004/5/25 بڵاوکراوەتەوە .

# مەجلیس*

دەگێڕنەوە لە سەردەمی کۆن لەنێو گوندێکدا کابرایەك لە سەردانی دەغڵەکەیدا، دەبینی کۆمەلێك گۆك و چێڵ لەناو دەغلەکەیدان بەشێك لە دەغلەکەیان خواردووە، بۆیە دەچێتە لای ئاغای گوندەکە، کە دەچێ ئاغاش مێوانێکی زۆری هەبووە، کابرا بە ئاغا دەڵێ، ئاغاش دەڵێ: باشە دواتر تۆڵەی لێ دەسێنمەوە، کابرا زۆر بە غەمباریەوە دەڵێ: ئاغام خۆش بی دەغڵەکەم زۆر خوراوە، ئاغاش لێی دەپرسێ، گۆلك و چێلەکان زۆر بوون، کابرا دەڵێ: ئاغام خۆش بی بەقەد ئەو مەجلیسە دەبوو .

# بێ بەخت و بێ یەغبار*

دەگێڕنەوە، بێ بەخت و بێ یەغبار گەنمیان چاند بوو، کاتی دوورنە هاتبوو، بێ بەخت دەیگوت با سبەی نەچین بۆ دوورنە، بێ یەغبار دەیگوت با دوو سبەش نەچین بۆ دوورنە .

---

* لە ڕۆژنامەی پاڵە ژمارە/82/ ڕۆژی 2004/5/25 بلاوکراوەتەوە .

* لە ڕۆژنامەی پاڵە ژمارە/79/ ڕۆژی 2004/2/25 بلاوکراوەتەوە .

# با قوماشەکە بۆ تۆ بێت*

دەگێرنەوە دوو پیاو هەردووکیان ڕاوچی دەبن و هەر یەکێکیان هی وڵاتێك دەبن، ڕۆژێك لە ڕاو هەریەك لەلایەکی قوماشێکی درێژ دەبینێ و لولی دەدەن تا هەردووکیان بەیەك دەگەن، دەبێتە کێشەیان ئەو دەڵێ، بۆ منە، ئەو دەڵێ، بۆ منە، بۆ ئەم کێشەیە دەچنە لای ڕدێن سپییەك بۆ ئەوەی چارەکیان بۆ بکات، پیاوی ڕدێن سپیش دەڵێ: هەر یەك لەئێوە کامەتان درۆیەکی گەورەتری کرد بۆ ئەو بێت.

پیاوی یەکەم دەڵێ: جارێك باوکم دەچێ بۆ ڕاو، بزنە کێویەکی گرتبوو هێنایە ماڵێ و دایکیشم گۆشتەکەی لێنا، بەلام گۆشتەکە هەمووی ڕژابوو ئاوەکەشی لەناو مەنجەلەکە مابۆوە، ڕاوچی دووەم دەڵێ: کەڵەبابێکم هەبوو، هەرچی کاروان بوو پێم دەکرد، جارێك، بارێکی کونجیم لێکرد گەیشتمە سەر ڕووبارێك کەڵەبابەکەم نەیتوانی بپەڕێتەوە، منیش هەموو کونجیەکانم بە دار لاستیك فڕێدا ئەو بەری ڕووبار، دوایش بەخۆم و کەڵەبابەکەم پەڕینەوە بارەکەم دووبارە بارکردەوە و، بەلام بارەکە خوار بوو ئەویش لەبەر دیار نەبوونی یەك دەنکە کونجی بوو ،هەستام بێژینگم هێنا و هەرچی خۆڵی شوێنەکە بوو دام بێژی، نەم دۆزیەوە، سەرەندم هێنا خۆڵەکەم هەموو دابێژی دەنکەکە لەناوی مایەوە، هاویشتمە سەربارەکە و ڕاست بووەوە و بەرەو ماڵەوە ڕۆیشتم، بارەکەم فڕێداو دیار بوو پشتی کەڵەبابەکەم برینداربوو، گەڕام بەدوای دەرمانێك نەبوو، بەلام دایکم گوتی: وەرە ئەم پارچە گوێزە

* لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر ژمارە/1/ بلاوکراوەتەوە .

لێدە هی ئەو ڕۆژەیە کەمنیان بۆ باوکی تۆ دەهێنا، گوێزی پێدام منیش لێمدا بووە یەك دارگوێزی گەورە حەوت سەد کەس دەچوونە سەری دەنگی کەسیان نەدەگەیشتە کەس، کەستەکە خۆڵێکم هاویشت بۆ گوێزەك بووە یەك پارچە زەوی، حەوت سەد جوتیار چوون بیکێڵن، دەنگی هیچ لە جوتیارەکان ناگاتە ئەویدی، جا پیاوە ڕدێن سپییەکە دەڵێ: توخوا بەسە با قوماشەکە بۆ تۆ بێت .

# ئەوەی دەمرێ*

دەگێڕنەوە، لە سەردەمی کۆن لە گوندێکدا کابرایەك دەمرێت، گوندەکە مەلای نابێ تەلقینی بدات، بۆیە یەکێ ڕادەسپێرن، دەچێتە گوندەکی دیکە مەلای دەهێنێ، دوای تەلقیندان کابرا دەڵێ: خەڵکینە ئەوەی دەمرێ با ئێستا بمرێت، چونکە مەلا دەگەڕێتەوە .

* لە ڕۆژنامەی پاڵە ژمارە/79/ ڕۆژی 2004/2/25 بڵاوکراوەتەوە .

# مەکری ژنان*

دەگێرنـەوە، پیاوێـك هـەبوو زۆر خـۆی پـێ زۆرزان بـوو، هـەردەم لـە خـۆی ڕازی بـوو بـە لـە خۆبـایی بوونـەوە دەیگـوت: کـەس لـەمن زۆرزانـتر نییە و کەس نـاتوانێ فێڵ لـە من بکـات، ڕۆژێك گوتیـان ئافرەتێك لـەفلان گونـد هەیـە زۆر مەکرۆیـە، کـابرا گوتی دەچمە لای مـەکری دەبڕم، وتیـان پیـاوەکی باشـبە مەچـوو نـەوەکو ئـەم ئافرەتـە تـەنیا بـەنیو مـەکر کـارت لێبکات، کابرا گوێی پێنـەدان چوو بووە مێوانی، ئافرەتەکـەش زانـی کـە ئەو پیـاوە بۆ نیـازێکی واهـاتووە، بۆ ئێـوارە مریـشکێکی بۆ کوشتەوە و کولاندی و لەپێشی دانـا، کـابرا دەسـتی بـرد بۆ ئـەوەی گۆشتەکە بخوات ئافرەتەکـە بـە هـەموو هێزێکـەوە قیژانـدی و هـاواری کـرد پـێش ئـەوەی خەڵك خڕببنەوە بە کابرای گوت: ڕانـە گۆشـتێك لـەناو دەوی خـۆت بنێ و خـۆت لـەخۆ بـچوێنە، کـابراش وایکـرد، خـەڵك خڕبوونـەوە گوتیـان ئـەوە چـیە، ئافرەتەکـە گـوتی: ئـەو پیـاوە هـەژارە میوانمـان بـووە، منـیش مریشکێکم بۆ سەربڕی ڕانە گۆشتێکی لـەناو دەمـی خـۆی نـا تـا بیخـوات یەکسەر بەهۆش خۆی چوو، جا خەڵکەکە بەچوار دەسـتە کابرایـان هێنـا دەرێ و چـەند تەنەکـە ئـاوێکی سـاردیان پێـداکرد، کـابرا لـە سـاردیان لەرزی گرت و خۆی پێ ڕانـەگیرا دەسـتی کـرد بـە جولـە جول، ئافرەتەکـە گوتی: هەڵی بگرن و بیبەنەوە ژووریٚ وا بەخۆهاتەوە.

خەڵکەکـەش دەیبـەنـەوە ژووریٚ و دواتـر پـەرتـەیان لێکـرد و هەرکـەس چـوونەوە، جـا ئافرەتەکـە بـە کـابرای گـوت: هـەی هـەژار ئـەوە هـاتبووی

---

* لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر ژمارە/1/ بلاوکراوەتەوە .

مـەكری مـن بـڕی ئـەوە تـەنیا نیـو مـەكر بـوو لێمكـردی، گـەر مـەكرێكی تـەواوم لێبكردبای ئـەوە مەپرسـە چیت بەسـەر دەهـات، كابرا بـەو شـەوە هەسـتا ڕۆیـشت و گەڕایـەوە بـۆ ماڵی خـۆی، هـەروەها ئافرەتەكـە بـەناوی بـەخێرهاتنی ئەمەشـی پێـوت توخـوا كەچـوویەوە چـیت دیـت هـەمووی بگێڕەوە .

# كلكی لە خۆمان بوو*

دەگێڕنەوە، لـە دارسـتانێكدا دار بەڕوویـەك لەڕەگـەوە هەڵكێشرا بـوو، لێیان پرسـی: كێ ئەو زوڵمـەی لێكـردووی دار بـوو گـوتی: ئـەوەی زوڵمـی لێكردووم كلكی لە خۆمان بوو .

* لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلكلۆر ژمارە/1/ بڵاوكراوەتەوە .

# شیوی زۆر کابان سوره، یان بیّ خویّیه*

دەگێڕنـەوە کابرایـەکی ڕەوەنـد شـەش کـوڕی دەبـیّ، ژنیـشی بـۆ هـەر شـەش کـوڕی هێنـابوو هـەر هەمووشـیان بەیەکـەوە دەژیـان، لـەژیانێکی بەختـەوەر خـاوەن مـەڕ و مـاڵاتێکی زۆر، دەڵـێن ڕۆژێـك لـە ڕۆژانـی زسـتان مێوانێکیـان دێـت ئـەوانیش چێـشتی ئـەم ڕۆژی مەنجـەڵێکی گـەورە پـڕ لـە نیسك دەخەنە سەر ئاگر و ئینجا خـەریکی تێبـەردان و هـاوێرکردنی مـەڕ و ماڵات و کار و بەرخ و جۆدانیـان بـوون، کـابرای مێـوانیش لەبـەر ئاگر و مەنجەڵی نیسك دانیشتییە، میوان کە دیقەت دەدا تورەگەی خـویّ بەدیار مەنجەڵەکـە بـەداریّ وەکرایـە، هـەر ئافرەتـە و دێـت مـستەخوێیەك لـەو مەنجەڵـە دەکـات، کـابرای مێـوان لـە دڵـی خۆیـا دەڵـیّ، ئـەوە شـەش مـستە خویّ لـەم شـیوە بکـەن تـازە نـاخوریّ، ئـەویش یـەك مستە خـوێی دی تـیّ دەکات، ئێوارە کە شیو تێکرا لە سوریان ناخوریّ جا دەبیّ بەمقۆ مقۆی بوکـەکان ئـەو دەڵـیّ: مـن خـوێم تێکـرد، ئـەو دەڵـیّ: منـیش خـوێم تێکـرد، بۆیـان ڕوون دەبێتـەوە کـە هـەر شـەش بـووك خوێیـان تێکـردووە، کـابرای میوانیش دەڵیّ: وەڵڵا منیش مستێکم تێکرد، کابرای خـاوەن ماڵ دەڵـیّ: باپیرانمان بە درۆ نەیانگوتووە کە شیوی زۆر کابان، یان سوورە، یـان بـیّ خویّ .

---

* لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر ژمارە/1/ بڵاوکراوەتەوە .

# خانێ و مانێ*

دەگێڕنەوە، کابرایەك دوو ژنی دەبی، ژنی گەورە ناوی خانێ و ژنی بچووك ناوی مانێ، هەریەکەو ماڵی جیا دەبێ دەڵێن کابرا شەوێك لەلای ژنی گەورە دەبی ژنە بە دزی بە مووکێش مووە ڕەشەکانی سەر و چاوی دەردەهێنا تا بەو مەبەستەی کە بڵێن پیاوەکەی پیرە، بۆ رۆژی دواتر دەچێتە ماڵی ژنە  بچووکەکە ئەویش شەو بە دزی بە مووکێش گشت مووە سپییەکان دەردەهێنێ  بۆ ئەوەی نەڵێن پیاوەکەی پیرە، دەڵێن ڕۆژی دواتر بەبێ ئەوەی بزانێ وای بەسەرهاتووە، دەچێتە دیوەخان، ئاغا دەڵێ: بۆ وات لەخۆکردووە، کابراش دەڵێ: چیم لەخۆکردییە، ئاغا دەڵێتە خزمەتکارێك بڕۆ نەینۆکەکی بۆ بهێنن با سەیرێکی خۆی بکات، کە نەینۆك دێت کابرا سەیری خۆی دەکات ئەو کات بۆی ڕوون دەبێتەوە کە بۆ وایلێهاتووە، ئینجا ڕوو لە ئاغا دەکا و دەڵێ: وەڵڵاهی چیت لێ بشارمەوە بە خانێ و مانێ ئەمنیان کردیتە شەتڵی ڕەحانێ .

* لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر ژمارە/1/ بڵاوکراوەتەوە .

# هەموو برادەرێك برادەر نییە*

دەگێڕنـەوە، دەڵـێن کابرایـەکی دەوڵەمەنـد و خـاوەن سـەروەتو سـامان دەمرێت و تەنیا تاقە کوڕێکی هەرزەکاری لـە پـاش بـەجێ دەمینـێ لەگـەڵ چەند خوشکێکی و پیرە دایکی، دایکی کوڕە هەموو دەم ئامۆژگاری تاقـە کوڕەکـەی دەکـرد و دەیگـوت، ڕۆڵـە ئـەتو ئـەوڕۆ لەشـوێنی بـاوکی خـۆتی دەبی زۆر ئاگات لە من و خوشکۆران بی، ئەو مـاڵ و سـامانەی لـە باوکـت بۆمـان بـەجێماوە بـە فـیڕۆی نـەدەیی و برادەرایـەتی و هاوڕێیـەتی هـەموو کـەس مەکـە، کوڕەکـەم هـەموو برادەرێـك برادەرنییـە، بـۆ خـۆت ئاقـل بـە برادەرەکانـت تاقیبکـەوە و دۆسـت و دوژمـنی خـۆت بناسـە، کوڕەکـەش ڕۆژێك، لەگەڵ چـەند برادەرێکـی پێکـەوە دانیـشتبوون بۆ تاقیکردەوەیـان گوتی: برایان ئاونێکی ئاسنمان لـە ماڵـەوە هـەبوو، دوێنـێ ئێـوارە سـاغ و سـەلامەت بـوو، بـەڵام کـە بـەیانی تەماشـامان کـرد ئاونەکـە یـەك پارچـەی بچووکی مابوو ئەویدی هەموو مشك خواردبووی، یـەکێك لـە برادەرەکـانی گـوتی: ئـۆی لـەم درۆیـە گەورەیـە، برادەرەکـانی دی، گوتیـان کاکـە بـۆ درۆیە، دیارە ئاونەکـە شـتی شـیرینی لـەناو کوتراوە، مـشکەکانیش تـامی شـیرینیان لێکـردووە بۆیـە هـەموویان خـواردووە، کـوڕە گەڕایـەوە ماڵـەوە بەدایکی گوت کە برادەرەکانی تاقیکردۆتەوە و بەسەرهاتەکەی بۆ دایکـی گێڕایەوە، دایکی گوتی: کوڕەکەم ئەو برادەرەی کـەپێی گـوتی: درۆیـەکی گەورەیـە ئـەوە بـرادەری ڕاسـتەقینەتە، ئەوانیـدی بـرادەرت نینـە، کـوڕم لێیـان دوورکـەوە، بـەڵام کـوڕە بەگوێی دایکـی نـەکرد، سـاڵ هـات و ڕۆیـی

---

* لە ژمارە/1/ی گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر بڵاوکراوەتەوە .

کوڕه هیچ پاره و پولێکی نهما هەرچەند بڵێی هەژار بوو، بە دەرۆزە کەوت، ڕۆژێك چووە لای ئەوانەی کە درۆکەیان بۆ پینەکرد، گوتی: هیچمان نییە، ئێواره یەك کەرتە نانمان بۆ جەمی بەیانی هەڵگرتبوو کە بەیانی تەماشامان کرد کەرتە نانەکە نەمابوو، مشك خواردبووی ئەوانیش لەقاقای پێکەنین دەدەن و بەگاڵتە جاڕیەوە دەڵێن: ئۆی لەم درۆیە گەورەیە کوڕه بەچاوێکی پڕ فرمێسك و قورگی پڕگریانەوە دەڵێ: ئەو ڕۆژەتان لەبیره گوتم: ئاونێکمان هەبوو مشك خواردی گوتتان ڕاستە بۆ ئێستاش دەڵێن درۆیەکی گەورەیە، جا کوڕه ئامۆژگارییەکانی دایکی بەبیرهاتەوە و بە هەناسەیەکی سارد رووی لە برادەرەکانی کرد و گوتی: من نەزان بووم بیرم لەوە نەکردبۆوە کە باپیرانمان بە درۆ نەیان گوتووە، (ئەوەی دەتگرێینێ دۆستتە، ئەوەی پێت پێدەکەنی دوژمنتە) یا گوتویانە (هەتا هەتبی بە مام و خاری ئەگەر نەتبوو بێکەسوکاری) لەپاش ئەم کارەساتە بەردەوام بوو لە کاروکارسبی کردن و خزمەت کردنی دایك و خوشکەکانی .

# لەبرسان مردی*

دەگێڕنەوە پیاوەك هەبوو زۆر دەوڵمەند بوو خاوەن مرك و مەڕ و ماڵاتێكی زۆر بوو، بەڵام هەر چەند بڵێی ڕەزیل ڕكی لە ددانی خۆی دەبۆوە كە نانی پێ دەخوارد ، ژن و منداڵەكانی خۆشی ڕقیان لێدەبۆوە، چونكە لەبرسان دەیان ناڵاند، دەڵێن ڕۆژەك زۆر حەزی دەچێتە گۆشت دڵیشی نەدەهات مەڕێك بكوژێتەوە بۆیە بڕیار دەدات بچێت بۆ شار نیو كیلۆ گۆشت بكرێت بۆ خۆیی و منداڵەكانی، كابرا ڕێگای شار دەگرێت دەڕوا، پێش نیوەڕۆ ڕێی كەوتە گوندێك بینی خەڵكی ئەم گوندە كۆبوونەوتەوە و بەرەو ماڵێك دەڕۆن پرسی، ئەرێ ئێوە بۆ كوێ دەڕۆن، گوتیان خاوەنی ئەم ماڵە هەر سێ جەم لە ڕاهی خوای شیو دەكەن خەڵكی نان دەدەن، كابراش گوتی: ئەوە لە بۆ من باشە بۆ خۆم لێرە تێر نان دەخۆم دەچمەوە ماڵ دەڵێم گۆشت نەبوو، نانی نیوەڕۆ و ئێوارەی لەوێ خوارد و شەویش لەدیوەخانی ئەم ماڵە پاڵی داوە، بە نیازی ئەوەی بەیانیش لەوێ نان بخوات، كاتێ شەو گەییە نیوەی شەو لەحەوشەی ئەو ماڵە بوو بە شڕپوو هۆڕ، كابرا لە ژوور قراری نەگرت هاتە دەرێ بزانێ ئەو شڕپە شڕپە چییە، بینی خاوەن ماڵ لەگەڵ دوو ژنان وەرگەڕاینە قەبرێك بە كوتكان لێی دەدەن، كابرا سەبری نەما پرسی: ئەرێ ئێوە بۆ لەم قەبرە دەدەن، خاوەن ماڵ وەڵامی دایەوە و گوتی: ئەم قەبرە قەبری برامە، ئەم دوو ژنە ژنی ئەو بوون، ئەم ماڵە ماڵی ئەو بوو، ئەو مەڕ و مركە هەموو هی ئەو بوو، دڵی نەدەهات ماڵی خۆی

* لە ژمارە/1/ی گۆڤاری ئاسۆی فۆلكلۆر بڵاوكراوەتەوە .

بخوات هەتاكو مرد، جەمێك لەماڵی خۆی تێر نانی نەخوارد كەمردیش ماڵەكەی لەبۆ من بەجێما، منیش بە كەیفی خۆم دەیخۆم و خێر و پیاوەتیشی پێدەكەم، هەردوو ژنەكەشم مارە كردۆتەوە، هەموو شەوێكیش 500 كوتك لەقەبرەكەی دەدەین، كابراش وردە وردە بیری لە كردەوەكانی خۆی دەكردەوە، ئینجا گەڕایەوە دیوەخان و چووە سەر جێگایەكەی بۆ ئامادەكرابوو، پاڵ كەوت و بیرێكی لەخۆ كردەوە و گوتی: یەكێك بوو وەك من، منیش وەك ئەوم بەسەردێت، هەرلەوێ سوێندی خوارد چیتر چاوچنۆك نەبێ، دەڵێن هەر كە گەڕایەوە ماڵ چەندین مەڕی سەربڕی و كردییە خێر و ماڵ و منداڵەكەشی لە گۆشت تێر بوون .

# گەر نەیەوە*

دەگێڕنەوە لەنێو كوردەوارییدا، لە گوندێكدا ڕۆژێ ژنەك لە پیاوەكەی دەتۆرێ چەند ڕۆژەكی پێدەچێ نایەتەوە، چەند كەسێك دەنێرێ هەر ناگەڕێتەوە، بۆیە خۆی دەچێت بە ژنەكەی دەڵێ: گەر ئێستا دێیەوە باشە گەر نا، ئەوە هەر چەند جوجكەی هەتە سەری هەڵدەكێشم، ژنەكە لەگەڵیدا دێتەوە، خەڵكی گوند كە دەپرسن چۆن ڕازی بوو بگەڕێتەوە ئەویش دەڵێ: دەزانم ژن جوجكەیان زۆر خۆش دەوێ بۆیە گوتم: گەر ئێستا لەگەڵم نەیەوە ماڵێ سەری هەموو جوجكەكانت هەڵدەكێشم .

---

* لە ڕۆژنامەی پاڵە ژمارە/79/ ڕۆژی 2004/2/25 بڵاوكراوەتەوە .

# بۆ باسی مانگای سور ناکەن*

دەگێڕنەوە کابرایەك حەوت کوڕی دەبێت خێزانەکەی دەمرێ، زۆر حەز دەکات ژن بهێنێ، بەڵام لەبەر نەبوونی کە تەنیا مانگایەکی سوریان دەبێت، کوڕەکانیشی زۆربەیان گەنج دەبن و هیچیشیان ژنیان نەهێناوە، دەڵێن: ڕۆژێك هەر حەوت برا لەگەڵ یەکدا لەژوورەوە دانیشتوونە، برای گەورە ڕوو لە برایەکانی دەکات و دەڵێ:ئێمە حەوت براینە و هیچمان ژنمان نەهێناوە، وا باشە مانگای سور بفرۆشین بۆ باوکمان بە ژن بدەین لەم کات باوکیان بەژوور دەکەوێ، گوێ بیستی ئەم قسەیە دەبێت، بەڵام وا لەخۆ دەکات کە گوێ بیست نەبووە، ماوەیەکی زۆری پێدەچێت چیتر کوڕەکان ئەم قسەیە ناکەن، بۆیێ ئێوارەیەك باوکەکەیان لەگەڵ کوڕەکان دانیشتوونە باوکە ڕوو لە کوڕەکان دەکات و دەڵێ: ئەرێ بۆچی ئێستا باسی مانگای سور ناکەن.

---

* لە ژمارە/1/ی گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر بڵاوکراوەتەوە .

# خودا ماڵی پێنەداوە*

دەگێڕنەوە، دوو برا دەبن یەکێکیان زۆر دەوڵەمەند و ئەویتر تا بڵێی هەژار، خزم و کەس و کاریان هەردەم بە برا دەوڵەمەندەکەیان دەگوت یارمەتی برا هەژارەکەت بدە، پارەی پێ بدە، با بۆ خۆی کاری پێبکات، ئەویش دەیگوت: براینە بەخوا زۆر یارمەتی دەدەم و پارە و ماڵم پێ بەخشیوە، بەڵام چیبکەم خوای گەورە وایداناوە هەژار بی، گەر بڕوا ناکەن با تاقی بکەینەوە، دەڵێن لەپێش چاوی چەندین خزم و کەس و کاریان کوپە زێڕی لەسەر ڕێگای برایەکەی دادەنێت، دەڵێ: گەر هەڵی گرت بۆ خۆی بێ .

خزم و کەسوکاریش سەیریان دەکرد، هەژاریش بەرێگایەکە دا دەهات هەرکە نێزێك کوپە زێڕەکە دەبێت دەڵێ: با چاوەکانم بچوقێنم بزانم کوێرەکان چۆن دەتوانن بڕۆن، بەچاوی نوقاو دەڕوا هەتا لەکوپەکە دوور دەکەوێتەوە، ئینجا چاوی دەکاتەوە، جا برا دەوڵەمەندەکە دەڵێ: براینە خودا ماڵی پێنەداوە .

* لە ژمارە/1/ی گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر بڵاوکراوەتەوە .

# جوانترین و ناشیرینترین پیاو*

لـه کوردەواریــدا دەگێڕنــەوە پاشــایەك دەبــێ، جارێکیــان داوا لــە خزمـەتکارەکانی دەکات، هـەر کەسێك جوانترین و قۆزترین پیاو بهێنتـە کۆشـك کـە مـن نەمـدیبێ خـەڵاتی دەکـەم، خزمـەتکارەکان دوای چـەندین سـاڵ گـەڕان کـوڕە گـەنجێکی زۆر جـوان و قـۆز، دەبیننـەوە و دەیهێننـە کۆشـك، پاشـا کـە دەیبـینێ دەڵـێ: ئەشـهەدو جـوانی ئـاوام نـەبینیوە، خزمـەتکارەکان خـەڵات دەکـات، لـەدوای ئەمـە ماوەی چـەند ساڵێکی پـێ دەچـێت پاشـا ئـەم جارەیـان داوا لەخزمـەتکارەکان دەکـات ناشـیرینترین کـەس بدۆزنـەوە و بهێننـە کۆشـك کـە ئـەو ناشـیرینی وای نـەبینی بێـت، خزمەتکارەکان چەندان ساڵ دەگەڕێن، تا ڕۆژێك کابرایەکی زۆر شەپڕێو و ناشیرین و پیس دەبینن، یەکسەر دەیهێننە کۆشك پاشا کە سەیری دەکـات دەڵـێ: ئەشـهەدو پیـاوی وا ناشـیرینم نـەبینیووە خـەڵات بـە خزمــەتکارەکان دەبەخــشێ، کــابرای ناشــیرین ئاخێــك هەڵدەکێــشێ و دەگری و دەڵێ: ئای سەروەت و سامان کە خاوەنی تۆ بووم جوانترین و قۆزترین پیاو بووم، کە تۆم لە دەست چوو، بووم بە ناشیرینترین کەس .

* لە ژمارە/1/ی گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر بڵاوکراوەتەوە .

# خراپەم پێناکری*

دەگێڕنـەوە لـە گوندێکـدا، دوو کـەس لەبـەر هـەژاری و نـەداری سـەری خۆیان هەڵدەگرن و گوند بەجێ دەهێڵن، تا لەشارێکدا دەگیرسێنەوە، وا ڕێکدەکەوێت کە چەند ڕۆژەکی پێناچێت، کە پاشای شار دەمرێ، بۆیە خەڵکەکە بەپێی دابونەریتی خۆیان لە ئاقارێکدا گردەبنەوە، ئەوانیش ئەم نهێنیەیان زۆر لا سەیر دەبێ و لەیەکێك دەپرسن کە ئەم کارە مانای چییە؟ ئەویش وەڵامیان دەداتەوە و دەڵێت: کاکە لەم شارەدا وا باوە دوای مردنی پاشای شار باز هەڵدەدەن، ئەو بازە لەسەر سەری هەرکێ هەڵنیشت ئەو دەبیتە پاشا، یەکێکیان دەڵێ: بەخوا ئەگەر من ببم بە پاشا، چی باش بێ بۆ ئەو شارە دەکەم، ئەویتریان دەڵێ: ئەگەر منیش ببم بەپاشا چی باش بێ بۆیان ناکەم، باز هەڵدەدرێ و بەختی کابرا وای هێنا لەسەر سەری ئەو کەسە هەڵنیشت کە گوتبووی ئەوی باش بی بۆیان ناکەم، کابرا دەبێ بە پاشا هەرچی خراپ و کاری نا عادیلانە دەبێ لەگەڵ خەڵکەکەی دەیکات تا وای لێدێت خەڵکەکە زۆر لە دەستی بێزار دەبن، بۆیە چەند کەسێك دەچنە لای برادەرەکەیی و تکای دۆزینەوەی ڕێگە چارەیەکی لێدەکەن، ئەویش بەڵێنیدا بچێتە لای گەرچی زۆریش لەگیانی خۆی دەترسا چووە لای پاشاو پێی وت: برام ئێمە لەبرسان هەلاتوین و ئێستاکە تۆ لەنێو ئەم هەموو نیعمەتەی دای بۆ وادەکەی؟ پاشا دەڵێ: ئەوان خۆیان تاوانبارن ئەگەر ئەوان لەگەڵ یەکدی خراپ نەبن، من هەرگیز خراپەم پێ ناکرێ .

---

* لە ژمارە/1/ی گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر بلاوکراوەتەوە .

# هەقی خۆی وەرگرتەوە*

دەگێڕنــەوە، گایــەك گاوانەكــەی دەداتــە بەرقۆچــان و زۆر بــە ئــازار دەیكـوژی، چـەند گاوانـەك كـە لـە دەور و بـەریان دەبـن دەیبیـنن، بـەڵام ناوێرن لێی نزیك ببنەوە واتیێ دەگەن گایەكە هاربووە، بۆیە تـەنیا توانـای ئەوەیان لەدەست دێت بـەغاردان بچنەوە گوندەكە و خەبـەر بدەن و بڵێن گایـەك هـار بـووە  و فـلان گـاوانی داوەتـە بـەرقۆچ، كۆمـەڵێكی زۆر لـە پیـاوانی گونـد بەچـەكەوە دێـن بـۆ ئـەوەی گایەكـە بكـوژن، بـەڵام هەركـە خەڵكەكە دەگەنە لای گاڕانەكە دەبینن گایەكە هێمنە و خەریكی لـەوەڕە و گاوانەكەش گیانی دەرچووە و ئازارەكی زۆریشی بینیوە، پیاوەكان بەم ڕووداوە سەرسـوڕمان دەبـن هەریەكـەو قـسەیەكی بـەڕای خـۆی دەكـات، بەڵام پیاوەكی بە تەمەن دەڵێ برایـنە، ئەم ڕووداوەتان لاسـەیر نـەبێ ئەمـە هەقی خۆی وەرگرتەوە دالغەیەك دەیگری و دەڵێ: من لەیادمە چل ساڵ لەمەوبەر ئەم گاوانە بەچ ئازارێك باوكی خـۆی كوشت بۆیـە ئـەو سـزایەی هاتۆتەوە ڕێ .

---

* لە ژمارە/1/ی گۆڤاری ئاسۆی فۆلكلۆر بڵاوكراوەتەوە .

# شەپو هۆڕمە*

دەگێڕنەوە، لەسەردەمی کۆن لەنێو کوردەواریدا، لە گوندێك، کابرایەك دوو ژنی دەبێت بەناوی شۆپێ و هۆپێ، هەریەکە و ماڵێکی لە دووری یەکتری بۆ دادەنێ، یەك لەوبەری گوند و ئەویتر لەوبەری گوند لەنێوان هەردوو بەرەکەش بەستێکی گەورەی لێ دەبێ، دەڵێن لە شەوێکی زستان، باران وەك کوندەی سەرو خوار دەباری کابرا لەماڵی یەکێك لە ژنەکانی دەبێت، بەم شەوە و بەو بارانە کابرا هەڵدەستێ و دەچێتە ماڵەکەی دی و مل لە ڕووبارەکە دەنێ، لەناکاو شەپۆڵی ڕووبار لێی دەدا و دەیبا لەهیکڕا خۆی بە بنچکە دارێك دەگرێ، کابرا لەنێو ئەم ئازارە پێدەکەنێ و دەڵێ: ئاخ ئێستا شۆپێ وا دەزانی لەلای هۆپێمە، هۆپێش وا دەزانی لەلای شۆپێمە نازانن لەنێوان شۆپێ و هۆپێ وا لەبەر باران و لە ناو ڕووبار شەپوهۆڕمە .

* لە ژمارە/1/ی گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر بڵاوکراوەتەوە .

# هەولێرەکە لە کوێیە*

دەگێڕنەوە، لە گوندێك کابرایەکی بە تەمەن بە ناوی حەسەن، ڕۆژێك ڕوو لە کوڕە گەنجێکی ئاقڵمەند دەکا و دەڵێ: زۆر لام سەیرە ئەوە چەندین ساڵە دەچمە هەولێرێ شوێن نەماوە نەگەڕێم، بەڵام تا ئێستا نەمزانیووە هەولێرەکە لە کوێیە هەر دەڵێن ئەمە کورانە، ئەمە ئازادییە و ئەمە مەنتکاوەیە بەم جۆرە، ئەی باشە هەولێرەکە لە کوێیە؟!

گەنجی ئاقل پەنجەی لەسەر سەری دادەنێ و دەڵێ: ئەمە چی تووە ئەویش دەڵێ سەرمە، ئەمجارە پەنجەی لەسەر چاوی دادەنێ دەڵێ: ئەی ئەوە، ئەویش دەڵێ چاومە، بەمجۆرە پەنجەی لەسەر زۆربەی ئەندامەکانی لەشی دادەنێ لەناوەکانی دەپرسی، ئەویش وەڵامی دەداتەوە، ئینجا دەڵێ: ئەی باشە حەسەنەکە لەکوێیە، بەم جۆرە مام حەسەن دەڵێ: بەڕاستی دڵم ئاوی خواردەوە و تێی گەیشتم .

* لە ژمارە/1/ی گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر بڵاوکراوەتەوە .

# هەر ئەو ماستەیە گەلەك شتی لیٚ دروست دەبی*

دەگێڕنەوە، دوو برادەر دەبن یەکێکیان ماڵی لە شار و ئەویدیکەیان لە گوند، برادەری لە شار کرێکار و برادەری لە گوند خاوەن مەڕ و ماڵاتێکی زۆر و هەر کە دەهاتە شار میوانی برادەرەکەی دەبوو، ئەوانیش بەخێرهاتنی گەرموگوڕ و خواردنی باشیان بۆ دروست دەکرد، کابرای گوند دەیگوتە برادەرەکەی حەز دەکەم تۆش سەردانی ماڵمان بکەی تا خزمەتت بکەم، ماوەیەکی پیٚ دەچیٚ ڕۆژێك لە وەرزە بەهارێك کابرای شار دەچێتە گوندەکە و دەبێتە میوانی برادەرەکەی، ئێوارە لەکاتی نان خواردن برادەری گوند یەك جامە ماستی لەپێش دادەنیٚ لەگەڵ یەك نان و ئینجا دەڵیٚ: ئەم ماستە بە نرخە هەر قابیلی خواردنی برادەرێکی خۆشەویستی وەك تۆیە، چونکە هەر ئەو ماستەیە دۆ و کەشك و دانۆك و گەلەك شتی دیکەشی لیٚ دروست دەکریٚ، برادەری شار داڵغەیەك لێدەدا و ئەو هەموو ڕێزگرتنەی دێتەوە پێش چاو کە بۆی کردبوو، بەیانی دوا خوا حافیز بوونی یەکجارەکی لێخواست .

---

* لە ژمارە/1/ی گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر بڵاوکراوەتەوە .

# شتی بچووك پیاوەتی گەورەی پێدەکری*

دەگێڕنەوە دوو برادەر ماوەیەکی زۆر یەکتریان نەبینیبوو، یەکێکیان زۆر دەوڵەمەند خاوەن مەڕ و ماڵاتێکی زۆر ئەویتریش دەست کورت، برادەرە هەژارەکە لەبەر نەبوونی و نەداری لەکاتی دۆ دەچێتە لای برادەرەکەیی و بۆ داواکردنی دوو بزن کە دۆیەکەی بخوات، بەڵام دەگاتە حەوشەی ماڵێ دەبینی خەریکی پێگرتنەوەی کەڵەبابێکە، لە دڵی خۆیا دەڵێ پێی کەڵەبابێك دەگرێتەوە چۆن دوو بزن دەدات بە من دۆیەکەی بخۆم، هەر کە گەیشتنە یەك بەخێرهاتنێکی گەرم و گوڕی دەکات و گیسکەکی بۆ سەردەبڕێ و ئێوارە لەکاتی نان خواردنەکە کابرا کە سەیری ئەم هەموو گۆشتە دەکا لەپێشی پێدەکەنی، ئەویش لێی دەپرسی بۆ پێدەکەنی، برادەری میوان دەڵێ:ئەوی ڕاستی بی بۆ دوو بزن هاتم بۆ دۆ خواردن، بەڵام کە سەیرم کرد پێی کەڵەباب دەگرییەوە زۆر پەشیمان بوومەوە لە هاتنەکەم ئێستاش کە دەبینم ئەم هەموو گۆشتەم لەپێشە، برادەرەکەی بەخەندەیەك دەڵێ: دوو بزنت پێ دەدەم هەر بۆ خۆت هەروا دەڵێ: مرۆڤ بە ئاگاداری شتی بچووك پیاوەتی گەورەی پێدەکرێ .

* لە ژمارە/1/ی گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر بڵاوکراوەتەوە .

# کچێکی ئاقل*

دەگێڕنـەوە پاشـای شـارێك شـەوێك بـەنێو گەڕەکـەکان دەگـەڕێ بـۆ ئەوەی ئاگاداری ژیان و گوزەرانی شـار بـێ، دەبینـێ کچێك بەتـەنیا لەبەر چرایەك دانیشتیە دورمان دەکات، دەچێتە لای دوای سڵاو لێی دەپرسێ کوا باوکت کچە دەڵێ: دۆست بکات بە دوژمن، دەڵـێ ئـەی دایکت دەڵـێ چووە یەك بکات بە دوو، دەڵێ: ئـەی خـۆت خـەریکی چیت، دەڵێ: سـێ دەکــەم بەیــەك، دوای ئەمــە پاشــا دەگەڕێتــەوەماڵــەوە، هەرچــەندە بیردەکاتەوە لە وەڵامی کچە تێناگات، بۆیـە بـەیانی دەگەڕێتـەوە لای کچە و لێــی دەپرســێ، لــە وەڵامــەکانی دوێــنێ تێنەگەیــشتم، کــچە دەڵــێ: لـەوەڵامی دۆست دەکات بە دوژمن، ئـەوە بـاوکم بـۆ قـەرز چوو بووە لای دۆسـتێك دۆسـتەکەش قـەرزی پێنـادات، چـونکە بـاوکم هـەژارە دەزانـێ نیەتی قەرز بداتەوە واتـە وەك دوژمن دەبێت، بـۆ وەڵامـی دایکم: ئـەویش مامانە چوو بوو بۆ لای ئافرەتێکی دوو گیان، بۆ وەڵامی خۆم، سـێ کۆنـە کراسی دڕاوم هەبوو، خەریکی ئەوە بووم لـە هـەر سـێ کراسـەکە کراسـێك دروسـت بکـەم، لـەدوای ئەمـە پاشـا بـۆی ڕوون دەبێتـەوە ئـەم کـچە زۆر ئاقڵە، بۆ خۆی دەخوازێ و سامانێکی زۆریش بەباوکەکەی دەبەخشێ .

* لە ژمارە/1/ی گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر بڵاوکراوەتەوە .

# گەر خوا بدا ئاسانە*

دەگێڕنـەوە، کابرایـەك بـە سـەد دەردەسـەری و قـەرزداری مانگایـەك دەکرێت، بۆ ئەوەی ماڵ و منداڵی پـێ بژیێنێ، چەند ڕۆژەکی پێدەچێت مانگا نـەخۆش دەکـەوێ، کابرا لەخـەمان پـوت دەبی، بەڵام هـەر شـوکری خواش دەکات، مانگا دەکەوێتە دوا هەناسە بەناچاری سـەری دەبڕێت و گۆشتەکە پارچە، پارچە دەکات و ورگـی دەدڕێنێ و بەنیـەتی ئـەوەی کـە گۆشـتەکەی کیلـۆ، کیلـۆ بفرۆشـی هـەر کـە ورگـی دەدڕێـنی پارچـە عەلاگەیـەکی گرێـدراو لـەنێو ورگـێتی، کـە گرێـی عەلاگەکـە دەکاتـەوە چـەندین پارچـە زێـری تیایـە، کـابرا خواناسـە، زێڕەکـە هەڵـدەگرێ و دەچێتەوە مەیدان و لە دوای خاوەنی مانگاکە دەگەڕێ و دەیدۆزێتـەوە و بەسەرهاتەکەی بۆ دەگێڕێتەوە .

کـابرا دەڵـێ: منـیش کڕیومـە و یەکـسەر بـەتۆم فرۆشـتووە خاوەنەکەشـی ناناسمـەوە، ناچـار دوای پرسـین لـە زانایـانی ئـایینی ئیسلام، زێڕەکە بۆ خۆی دەبێت لەجێی ئەم مانگایە چەندین مانگای دی بۆ خۆی دەکڕێ و تا مردنیش بەردەوام خێر بە هـەژاران دەکات، ئێمـەش دەڵێین گەر خوا بدا ئاسانە .

---

* لە ژمارە/1/ی گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر بڵاوکراوەتەوە .

# سمێڵی چەور*

لە کوردەواریدا دەگێڕنەوە کابرایەکی هەژار هەبوو، حەزی نە دەکرد خۆی وا نیشان بدات کە هەژارە گۆزەیەکی هەبوو پڕی ڕۆنی کردبوو، هەر کە دەهاتە دەرەوە سمێڵی بەم ڕۆنە چەور دەکرد، گەرچی زۆربەی جەمی نانی هیشکی دەخوارد، دەڵێن: ڕۆژێک لەنێو مەجلیسێک دانیشتبوو، کوڕێکی بچوکی دەبێت دێتە مەجلیسەکە و دەڵێ: بابە ئەو گۆزەیەی کە دەست و سمێڵت پێ چەور دەکەی پشیلە خۆی لێدا و شکاندی، ئینجا دانیشتوەکان سەیرێکی یەکتریان کرد و ژیانی پیاوەیان بۆ ڕوون بۆوە و هەریەکە و بەگوێرەی توانای خۆی یارمەتیدا .

# خودا فێری لای نەخۆشت بکات*

دەگێڕنەوە کابرایەک هەبوو لەمیوانداری زۆر دادەنیشت، شەوێک دەچێتە سەردانی نەخۆشێک، نەخۆشەکەش هەر چەندە نەخۆشیەکەی بە ئازار دەبێت، بەلام بۆ ڕێزگرتن لە کابرا پاڵ ناکەوی، دوای دانیشتنەکی ئێجگار زۆر ئینجا دەڵێ: وا هەڵدەستم بەلام توخوا دوعای بەخێرم بۆ بکە، نەخۆشەکەش دەڵێ: خودا فێری لای نەخۆشت بکات .

---

* لە ژمارە/1/ی گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر بلاوکراوەتەوە .

* لە ڕۆژنامەی پاڵە ژمارە/72/ بلاوکراوەتەوە .

# بۆ خۆت بدوورەوە*

دەگێڕنەوە، کێخوایەك دوو ڕبە گەنم بە پیاوێکی هەژاری نێو گوند دەدات کە ناوی عەلی دەبێ، دەڵێن: بۆ ڕۆژی دواییی لەنێو مەجلیسی پیاوانی ئاوایی لەسەر سەکۆی مزگەوت، کوێخوا دەڵێ: عەلی ئەو دوو ڕبە گەنمەی کە دوێنێ پێمدای بیکە باراش هەر نانەکی لێدێت پڕ بەسێری، عەلی دەڵێ: باشە، رۆژی پاشتر کوێخوا دیسان بەدەنگێکی بەرز دەڵێ: عەلی ئەو دوو ڕبە گەنمەی بەتۆمدا مەیکە بە باراش بیکە بە ساوار، عەلی دەڵێ: باشە، ڕۆژی سێیەم بەهەمان شێوە دەڵێ: عەلی ئەم دوو ڕبە گەنمەی داومە بەتۆ مەیکە بە ساوار بیکە بەبڕوش، عەلی دەڵێ: باشە، ڕۆژی چوارەم دەڵێ: عەلی ئەم دوو ڕبە گەنمەی بەتۆمدا مەیکە بە بڕوش بڕۆ بۆ خۆت بچینە یەکو (10) دەبڕی سارەکی دیکە هەندێکی بفرۆشە و ئەویدیکەش بکە بە باراش بۆساڵترەکیتکە، عەلی هەژاریش لە دەست ئەم هەموو هەست بریندارکردنە بێزاریە دەچێ دوو ڕبە گەنمەکە دەهێنێ و لەدەور و بەری خەڵکەکە هەمووی تۆدا و بانگی قاز و مریشك و مراوی گوندی کرد و تا بۆ خۆیان بیخۆن، ئینجا گوتی: کوێخوا قسەم نەشکاندی ئەوە تۆمدا بایەك و (10) ببڕێ بۆ خۆت بیدوورەوە .

---

* لە ژمارە/1/ی گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر بڵاوکراوەتەوە .

# کە شەرم شکا*

دەگێڕنەوە لە سەردەمی کۆن گاوانێك کیژە پاشایەك دەخوازێ، دوای چەند ڕۆژەك گاوان بە ژنەی دەڵێ: بڕۆ نان کۆبکەوە، کیژە پاشاش دەڵێ: من کیژە پاشام شەرم دەکەم، گاوان دەڵێ: باشە تەنیا هی جیرانان بینە ئەویتر بەخۆم کۆی دەکەمەوە، کیژە پاشاش دەڵێ: باشە، کە نانی ماڵە جیرانەکان دەینێ شەرم دەشکێ، بۆیە دەڵێ: مادام ئەو نانەم هێنا، با تازە پیاوەکەم ئەزیەت نەکێشێ ئەوانی تریش کۆدەکەمەوە، بەم جۆرە دوای ئەوە ڕۆژانە کیژە پاشا خۆی نانی گاوانی کۆدەکردەوە .

# پێچکی ناخۆم*

دەگێڕنەوە لەنێو کوردەواری کابرایەك خاوەنی دوو ژنان دەبی، بەناوی نەجیە و خەجێ ڕۆژەك دەرێ دەچمە ڕاوێ کەروێشکی دەگرم، سەلك بۆ خەجێ، پێچك بۆ نەجیەی، نەجیەش دەرێ ئەمن پێچکی ناخۆم، کابراش دەرێ دەبی بیخۆی، ئەویش دەرێ وەڵڵا نایخۆم، بەم جۆرە دەبێتە دەمەقاڵێ و شەر هەڵدەگیرسێ، پیاوەکە دەست دەداتە چەکوشەکی لەسەری نەجیەی دەدات و خێن بەسەریدا دێتە خوارێ، بەبێ ئەوەی کابرا بچێتە ڕاوێ .

---

* لە ڕۆژنامەی پاڵە ژمارە/71/ بڵاوکراوەتەوە .

* لە ڕۆژنامەی پاڵە ژمارە/83/ ڕۆژی 2004/6/26 بڵاوکراوەتەوە .

# گەر خوا نەیدا بێسودە*

دەگێڕنەوە لە ناو کوردەواریدا ژنێك و پیاوێك هەبوون، زۆر یەکتریان خۆشدەویست، بەڵام بەتەمەن کەوتبوون و هیچ منداڵیان نەببوو، خزم و ناسیاو دراوسێییەکان، بەکابرایان دەگوت، بۆخۆت ژنێکی دیکە بێنە، کابراش دەیگوت: دیارە خوا منداڵمان پێنادا، گەر خوا منداڵم پێبدا لەم ژنەش هەر دەیدا من ژن ناهێنم.

دوای چەندین ساڵ شەوێك کابرایەکی ئیختیاری بەساڵاچوو خەون دەبینێ، لەخەونەکەیدا ئەم ژن و پیاوە کوڕێکیان دەبێ و کوڕە گەورە دەبێ و لەشەوی زاوایەتیدا گورگ دەیخوا، مام ئیختیار بۆ بەیانی لەدیوەخان خەونەکە دەگێڕێتەوە، بەڵام ناڵێ کوڕەکە گورك دەیخوا، دانیشتوانی دیوەخان هەندێك دەڵێن تازە منداڵی چی، هەندێکی دیکەش دەڵێن گەر خوا بیدا ئاسانە، ئەم هەواڵە دەگاتە ژن و پیاوەکە و زۆر دڵخۆش دەبن و دەڵێن مام ئیختیار چیت دەوێ مزگێنی، مام ئیختیاریش دەڵێ: با منداڵەکەتان ببێ، کابراش دەڵێ: باشە، ماوەیەکی پێدەچێت کوڕێکیان دەبێ، لەدوای مام ئیختیار دەنێرن بۆ ئەوەی مزگێنی پێ بدەن، مام ئیختیار دەڵێ، تا کوڕەکەتان ژن نەخوازێ مزگێنیم ناوێ، بەم جۆرە کوڕە گەورە دەبێ و کچێکی زۆر جوانی لێ مارە دەکەن، لەدوای مام ئیختیار دەنێرن مزگێنی پێ بدەن، مام ئیختیار دەڵێ، خانوویەکی پتەو دروست بکەن، بۆ ژووری بووك و زاوا، ئینجا لە دوای بووك گواستنەوە مزگێنیەکەم وەردەگرم، باوکی زاوا خانوویەکی

---

* لە ڕۆژنامەی برایەتی ژمارە/3162/ ڕۆژی 2000/8/22 بڵاوکراوەتەوە .

پتـەو دروسـت دەكـات و ئینجـا لـە دوای مـام ئیختیـار دەنێـرێ و مـام ئیختیاریش دێت و دەڵێ: بووك زاوا بهێننە ژوورەوە، بووك و زاوا دەچنە نێـو خـانووی پتـەو، مـام ئیختیـاریش لـەپێش دەرگـا هـەر نوێـژ دەكـات و دوعا دەكات بۆ سەلامەتی زاوا، تا بەیانی ڕۆژ هەڵدێ و باوكی كوڕە دێت لەگەڵ مام ئیختیار كە دەرگای دەكەنەوە دەبینن تەنیا بووك لەژوورەوەیـە بـاوكی كـوڕە دەڵـێ: ئـەی كوڕەكـەم، بووكەكـە دەڵـێ: ئـەم پیـستە زاوایـە، شەو بە ئەمری خوا من بووم بە گورگ و ئەویش بوو بە بەرخ من خـواردم، باوكی زاوا دەڵێ: ئەمە چۆن ڕاستە، مام ئیختیـاریش دەڵـێ: بـەڵێ ڕاسـتە بەسـەرهاتەكەی بـۆ دەگێڕیتـەوە، ئینجـا بـاوكی كـوڕە بـاوەڕی دێ و دەڵـێ من هەر لە زووەوە گوتوومە گەر خوانەیدا بێسودە .

# ئەقڵ لەكوێیە*

دەگێڕنـەوە لەسـەردەمی كـۆن كیـژە پاشـایەك هـەبوو، هەرچـی بچوبایە داخـوازی كیـژە دەیگـوت پرسـیارێكم هەیـە گـەر زانیـت مێـردت پێدەكـەم، گەر نەتزانی لەسەرت دەدەم، پرسیارەكەش ئەوە بـوو كـە دەیگـوت (ئـەقڵ لـە كوێیـە) چـەندین كـەس لـە كـوڕە پاشـا و ئاغـا هاتنـە داخـوازی و نەیانزانی كیژە پاشا لەسەریانییدا، دەڵێن تا ڕۆژێك كوڕە هەژارێ دێت و لەوەڵامـدا دەڵـێ: ئـەقڵ لەسـەر دایـە، ئینجـا كیـژە پاشـا مێـرد بـە كـوڕە هەژارەكە دەكات .

---

* لە ڕۆژنامەی پاڵە ژمارە/71/ بڵاوكراوەتەوە .

# ئەوەی خوا نەیکا نابیٚ*

دەگێڕنـــەوە لەکوردەواریـــدا لەســـەردەمی کـــۆن، کابرایـــەك چێشتخانەیەکی دەبێت لەبەر ئەوەی گەلێك پاك و ڕاستگۆ و خواناس دەبێت خەڵکێکی زۆر ڕوو لەم چێشتخانەیە دەکەن بۆ خواردن، کابرا هەردێت و دەچێت و دەڵێ: ئەوی خوا نەیکا نابێت، دەڵێن ئەم وتەیە دەگاتە پاشا، ڕۆژێك پاشا بە خۆیی و چەند خزمەتکارێکییەوە دێنە چێشتخانەکە و نان دەخۆن، لەپاشان پاشا دەڵێتە کابرای پارەمان لەبیرچووە، ها ئەم ئەلقەیەت پێ بدەم، تا کاتێ پارەکە دەنێرم ئینجا ئەلقەیەکەم بۆ بنێرەوە، کابرا دەڵێ: باشە، پاشا و خزمەتکارەکان دەگەڕێنەوە، ئینجا پاشا ئەمر دەکات، بە هەر چ جۆرێك بێت ئاڵقەکەی لێ بدزن، خزمەتکارێك دەچێت ئەلقەکەی لێ دەدزێت و دەگەڕێتەوە، پاشا دەڵێ: بڕۆ بیخەرە ناو دەریا، کابرا دەچێت دەیخاتە ناو دەریا ڕۆژی دواتر خاوەن چێشتخانەکە ماسیەکی گەورە دەکڕێ و دەیباتەوەماڵەوە خێزانەکەشی لە پاك کردنەوە کە ورگی هەڵدەدرێ دەبینێ ئەڵقەیەکی تێدایە، هەڵی دەگرێ تا مێردەکەی دێتەوە، ئینجا ئەڵقەکەی پێدەدات و دەڵێ: ئەم ئەڵقەیە لەنێو ورگی ماسیەکە بوو، کابراش دەڵێ: ئەوەی خوا نەیکا نابێت، دوای ئەمە هەڵی دەگرێ، ڕۆژی دواتر پاشا بە خزمەتکارێك پارەکە بۆ خاوەن چێشتخانەکە ڕەوانە دەکات و دەڵێ ئەڵقەکەشم بۆبهێنەوە، کابرای خاوەن چێشتخانەش ئەڵقەکەی پێ دەداتەوە و دەڵێ، ئەوەی خوا نەیکا نابێت، خزمەتکارەکە دەگەڕێتەوە،

---

* لە ڕۆژنامەی برایەتی ئەدەب و هونەر ژمارە/204/ ڕۆژی 2000/11/24 بڵاوکراوەتەوە.

لای پاشاو پاشا بەم کارەساتە سەرسوڕمان دەبێت، بۆیە خۆی دەچێتە لای کابرای چێشتخانە و لێی دەپرسێ، چۆن ئەم ئەڵقەیەت دەستکەوتەوە؟ کابرا بەسەرهاتی بۆ دەگێڕتەوە و ئینجا دەڵێ: پاشام خۆشبێ ئەوەی خوا نەیکا نابێت پاشاش دەڵێ: کەواتە پاشایەتیش هەر لەخۆت دێت تاجەکەی لەسەری خۆی دەکاتەوە دەیخاتە سەر سەری کابرا .

# بەخت بەبێ ئەقل بێسودە*

دەگێڕنەوە لەسەردەمی زوو، دوو کەس هەبوو، یەکێکیان گەلێك بەختدار، ئەویتریش گەلێك ئاقڵ، ڕۆژەك بەختدار لەجووت کردن، پارچە زێڕێك لەگەڵ نوکی هەوجاڕی دێتە دەرێ، یەکسەر بیر لەوە دەکاتەوە بەسودە بۆ دەرگای کۆڵیتی مریشك، کە ئێوارە دەگەڕێتوە ماڵ لەڕێگا تووشی کابرای ئاقڵ دەبێت، کابرای ئاقڵ دەڵێ ئەوەت بۆ چییە؟ ئەویش دەڵێ، دەیکەمە دەرگای کۆڵیتی مریشکان، ئاقل دەڵێ: بیدە بەمن سێ،چوار دەرگای کۆڵیتە مریشکت پێ دەدەم، بەختدار ڕازی دەبێ و دەگۆڕنەوە، بۆیە دەڵێن بەخت بەبێ ئەقڵ سودی نییە .

---

* لە ڕۆژنامەی برایەتی ژمارە/2970/ ڕۆژی 1999/11/16 بڵاوکراوەتەوە .

# حوكمی قەرەقوش*

دەگێڕنــەوە لەســەردەمی (قــەرەقوش)دا، جارێکیــان پیاوێــك لــەبن دیواری ماڵێك دادەنیشێ، لـەپڕ دیوارەکەی بەسـەردا دەکەوێ و دەمرێ، بـرای کـابرای مـردوو شـکایەت لـەلای قـەرەقوش دەکـات، دەڵـێ: برایـەکم لـەبن دیـواری مـاڵی فـلان کـەس دانیـشتبوو، بـەڵام لەبـەر ئـەوەی دیـواری حەوشـەکە زۆر چـروك بـوو، بەسـەریدا ڕمـا و مـرد، حـاکم لـەدوای خـاوەن ماڵ دەنێرێ، خاوەن ماڵ دێت، حـاکم لێـی دەپرسـێ: بۆچـی دیـواری ئـەم حەوشـەیەت هێنـدە چـروك دروسـت کـردووە، بـرای ئـەم کابرایـە لـەبنی دانیـشتووە و دیوارەکـە ڕمـاوە بەسـەریدا و کـابرا مـردووە، خـاوەن مـاڵ دەڵێ: حاکمم خۆش بێ، من تاوانبارنیم فلان بەننای دیوارەکەی دروست کردووە، ئەو تاوانبارە، حاکم لەدوای وەستاکە دەنێرێ و ئەویش دێت، حاکم لێی دەپرسێ، بۆ ئەم دیـوارەت چروك دروست کـردووە، بـرای ئـەم کابرایـە لـەبنی دانیـشتووە دیوارەکـە بەسـەریدا ڕمـاوە و کوشـتوویەتی، وەسـتا دەڵـێ: حـاکمم خـۆش بـێ مـن تاوانبـارنیم لـەکاتی ئـیش کـردن لەدیوارەکە کیژی پاشا بێرە داهات و جل و بەرگی هێندە جوانی لەبەردا بوو منیش هەر سەیرم دەکرد بەهۆی ئەمەوە خافڵام بۆیە وا چروك بووە، حاکم لەدوای کیژی پاشا دەنێرێ و ئەویش دێت و حاکم لێی دەپرسێ بۆچی فلان ڕۆژ جل و بەرگی هێندە جوانت لەبەر کردووە، ئەم وەستایە بـەهۆی ئـەم جوانیـەوە خـافڵاوە و دیـواری مـاڵی فـلان کەسـی وا چـروك دروسـت کـردووە، بـرای ئـەم کابرایـە لـەبن دیوارەکـە دانیـشتوە و لەبـەر

---

* لە ڕۆژنامەی برایەتی ئەدەب و هونەر ژمارە/207/ ڕۆژی 2000/12/15 بڵاوکراوەتەوە .

چروکی ڕماوە بەسەریداو کوشتوویەتی، کیژی پاشای دەڵێ:حاکمم خۆش بێ من تاوانبارنیم ئەم جل و بەرگانەم لەدوکانی فلاَن جوو کڕیووە، حاکم لەدوای جوو دەنێرێ و جوو دێت، حاکم ڕووداوەکەی لەسەرەتاوە بۆ دەگێڕێتەوە و لە ئەنجامدا جووەکە تاوانبار دەکات کە بووەتە هۆی مردنی کابرا، حاکم ئەمری ئیعدامی بۆ دەردەکات، دەڵێن لەبەر ئەوەی جووەی دوکاندار هێندە بەژن درێژ دەبێت ناتوانن ئیعدامی بکەن بۆیە بڕیار دەدات و دەڵێتە خزمەتکارەکان بڕۆن جووەکی کورتتر بهێنن جوو هەر جووە، ئەوانیش جووەکی دەهێنن و لەجیاتی ئەو ئیعدامی دەکەن .

# مارێکی گەورە*

دەگێڕنەوە لەسەردەمی کۆندا دوو کەس لەسەر شینایی دەبن، یەکێکیان مارێکی زۆر گەورە دەبینێ و بە بەردان لێی دەدا، بەلاَم سەری پان ناکاتەوە، مارەکەش خۆی دمرێنێ، دواتر بە برادەرەکەی دەڵێ با بیبەینەوە بەخەڵکی نیشان بدەین، کە ئەو مارە گەورەمان کوشتیە؟، هەرچەندە برادەرەکەی دەڵێ: بانەیبەینەوە، کابرا لەکەللەی شەیتان نایەتە خەوارەوە و مارەکەی خستە سەرشەنە و لەسەر ملی خۆی دایدەنێ و بەرەو ماڵ بەرێ دەکەون، لەڕێگادا مارەکە لەهیکڕایەك بە کابرای وەدەدا و دەیکوژێ .

* لە ڕۆژنامەی پاڵە ژمارە/71/ بلاَوکراوەتەوە .

# بمبەخشن*

دەگێڕنەوە لەسەردەمی کۆن لەنێو کوردەواریدا، ژن و پیاوێك تاقە کوڕێکیان دەبێ، ژنە نەخۆش دەکەوێت، هەست دەکا، نەخۆشیەکەی ترسناکە بۆیێ ڕۆژێك بە پیاوەکەی دەڵێت توخوا ئەگەر مردم وەسیەتم وابێ پێش شاردنەوەم دەستێکم لەبنڕابڕە، بەپارچە پەڕۆیەك توند و جوان ببەستە گەر ژنت هێنا بیدە بە ژنەکە و پێی بڵێ هەر کاتێك لە کوڕەکەم تووڕە بوویی و ویستت لێی بدەی بەوە لێی بدا، بەڵام ئەم نەهێنییەی لەلا مەدرکێنە، پیاوەکە دەڵێ باشە، دوای ماوەیەکی کورت ژنە دەمرێت، ساڵ دەسوڕێتەوە و کابرا ژن دێنێت و وەسیەتەکەش بەجێ دەهێنێت، باوەژن بەرامبەر بە کوڕەکە زۆر زاڵم دەبێت، ڕۆژی چەندین جار بە دەستەکە لێی دەدات، بەڵام کاری لێ نەدەکرد و هەر خڕ و پڕ دەبوو، باوە ژن لای سەیر دەبێت، بۆیە ڕۆژێك پارچە پەڕۆیەکە لێك دەکاتەوە، دەبینێ دەستێك لەنێویەتی، زۆر سەرسام دەبێ، کە پیاوەکەی دەگەڕێتەوە ماڵ لێی دەپرسێ، ئەویش بەسەرهاتەکە دەگێڕێتەوە باوەژن بەگریان و ڕۆ، ڕۆ ڕوو لەمێرد و زڕ کوڕەکەی دەکات و داوایان لێ دەکات بیبەخشن و بەڵێنیان دەداتێ کە جارێکی تر ئەو کردەوەی کە کردوویەتی دووبارەی نەکاتەوە .

---

* لە ڕۆژنامەی برایەتی ژمارە/3406/ ڕۆژی 2001/6/12 بڵاوکراوەتەوە .

# ئایشە ڕەش*

دەگێڕنەوە، ژنێك ناوی ئایشە ڕەش دەبێ، لەگەڵ پیاوەکەی گەلێك خراپ دەبێ، زۆربەی ئیشی ماڵی بەپیاوەکەی دەکرد، پیاوە لە دەستی بێزار بوو، دەڵێن ڕۆژەك خەریکی ئاو دەرهێنان دەبن لەبیر، کابرا پاڵێك بە ئایشە ڕەشوە دەنێ دەکەوێتە ناو بیرەکە، لەنێو بیرەکە عەزیایەکی لێ دەبێ، دەردێکی دەداتە عەزیاکە مەپرسە، دەڵێن چەند ڕۆژەکی پێدەچێ، کابرا گوریسێك بۆ ناو بیرەکە شۆڕ دەکاتەوە بۆ ئەوەی بزانێ ئایشە ڕەش ماوە، کە گوریسەکە هەڵدەکێشێتەوە هەست بە قورسایەك دەکات، کەسەری گوریسەکە نزیك دەبێ دەبینێ عەزیایەکە، دەیەوێ فڕێی بداتەوە ناو بیرەکە، عەزیایەکە دەڵێ، ڕزگارم کە لە دەست ئایشە ڕەش چی بڵێی بۆت جێبەجێ دەکەم، کابراش دەڵێ: کچی پاشام دەوێ، عەزیاکە دەڵێ: باشە هەر کە هاتمە دەرێ، دەچم لەملی کچە پاشا دەئاڵێم و بەکەس لێ نابمەوە تا بە ئەمری تۆ نەبێ، بەلاّم جارێکی دیکە نەیەی، کابرا دەڵێ: باشە، بەم جۆرە عەزیایەکە لەنێو بیرەکە دەیەتە دەرەوە دەڕوا لەملی کچی پاشا دەئاڵێ کەس ناوێرێ بەنزیکیا بچێ کابرا کە دەبیسی دەچێتە لای پاشا و دەڵێ: من دەتوانم کچەکەت ڕزگار بکەم بەوشەرتەی کچەکەت ببەخشی بە من، پاشا ڕازی دەبێ و کابرا دەچێتە لای عەزیایەکە عەزیا دەڕوا، پاشا کچەکەی پێ دەدات، چەند ڕۆژەکی پێدەچێت عەزیا لە شارێکی دیکە لەملی کچی پاشای دەئاڵێ، پاشا ئەمر دەکات هەرچی کچەکەی ڕزگار بکات چی بڵێ پێی

---

* لە ژمارە/1/ی گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر بلاّوکراوەتەوە .

دەبەخشێ، هەواڵی پێشوو بەم پاشایە دەگات، بۆیە پاشا خۆی تەشریف دەفەرمووێ و دێتەلای کابرا و دەڵێ، دەبێ هەر بێی کچەم ڕزگار بکەی، کابراش لەشەرمان بەگەری دەکەوێ گەرچی ئەمەشی لەبیرە کە عەزیایەکە وتبووی جارێکی دیکە نەهێی، عەزیایەکە کە کابرای دەبینی بەتووڕەیی دەڵێ: بۆ هاتی نەمگوت چیتر نەیەی، کابراش دەڵێ: هاتووم ئەوەت پێ ڕابگەیەنم ئایشە ڕەش لەنێو بیرەکە هاتۆتە دەرێ، عەزیا بەخێرایی لەملی کچە دەبێتەوە و هەردێت، کابراش بەخششی خۆی وەردەگرێ و دەگەڕێتەوە .

# تا لەگەڵ گۆسکەیەکی دیکە ڕادێم*

دەگێڕنەوە لەسەردەمی کۆن لەنێو کوردەواریدا لە گوندێکدا کابرایەك گۆسکەیەکی هەبوو، هەموو ڕۆژێ پڕی ئاوی دەکرد و دەیزانی کەی ئاوەکەی سارد دەبێت و تا چەند بەشی دەکات، ڕۆژێك گۆسکەکەی لەدەست بەردەبێتەوە و دەشکێ، زۆر خەمی بۆ دەخوات، خزم و ناسیاوەکانی پێی دەڵێن شکانی گۆسکەکەیەك هێندە خەمی ناوێ، کابراش دەڵێ خەم لە گۆسکەکە ناخۆم، خەم بۆ ئەوە دەخۆم تا لەگەڵ گۆسکەیەکی دیکە ڕادێم .

* لە ڕۆژنامەی پاڵە ژمارە/72/ ڕۆژی 2002/12/25 بڵاوکراوەتەوە .

# گۆزەکەم شکا کۆرە بم*

**دەگێڕنەوە، کابرایەك هەبوو، زۆر لەژنەکەی دەترسا، ژنە دەردەکی دەدایێ مەپرسە، زۆربەی ئیش و کاری ناو ماڵیشی بە مێردەکەی دەکرد ڕۆژەك سەر لە ئێوارە ژنە بە پیاوەکەی دەڵێ: بڕۆ ئەم گۆزەیە لەکانی پڕی ئاوی سارد بکە و بە زوویی بگەڕێوە، کابرا دەچێ پڕ ئاوی دەکا و دەگەڕێتەوە، بە ئەمری خوا گۆزە لەڕێیی لە دەستی بەردەبێتەوە و دەشکێ، کابراش لە ترسان نازانی کو بچێتەوە ژووریٚ و چی بڵێ، بۆیە لە پێش دەرگای ماڵ دێت و دەچێ، ژنە لە کەلێنی دەرگا سێبەرێك دەبینێ دێت، دەڕوا، ژنە بە تورەیی هاوار دەکا، ئەوە کێیە؟ پیاوەکەش بە ترسەوە دەڵێ:**

**گۆزەم شکا کۆرەبم**

**بێمە ژوور، یان لێرەبم**

* لە ڕۆژنامەی برایەتی ژمارە/2960/ ڕۆژی 1999/11/22 بلاوکراوەتەوە .

# فلان پیاو منداڵەکەی بوو*

دەگێڕنەوە کابرایەکی هەرچەند بڵێی دەوڵەمەند، گەلەك ڕەزیل دەبێ، سێ جەم خواردنی نانی هیشك، یان نان و توور دەبێ، ژنەکەی لە دەستی زۆر بێزار دەبێ، دەڵێ فێڵەك نەبینمەوە لەبرسان دەمکوژێ، ڕۆژێك دارێکی درێــژ پەیدا دەکات و سەری دارەکە قاڵبێك بنیشتی جۆراوجۆری پێوە دەنووسێنێ و لە کولانکەی خانوو دەخاتە ژوورەوە بەنێو لیران دێنێ چەندین لیرەی پێوە دەنووسێ، بە لیرەکان خواردنێکی زۆر دەکڕی و هەر کە پیاوەکەی دێتەوە ئەم هەموو خواردنە بەلەزەتەی لەپێش دادەنێ، کابرا دەڵێ: ئەم هەموو خواردنەت لەکوێ هێناوە، ژنە دەڵێ: ماڵی باوکم پارەیان پێداوم منیش ئەم خواردنەم پێکڕیوە، کابرا دەکەوێتە سەر خواردنەکە و زۆری دەخوات بۆیە نەخۆش دەکەوێت، ڕۆژەك چەندین کەس لەلای دەبێت، ژنەکەی بەدزی منداڵێکی بچووك دەهێنی لەلای دواوەی پیاوەکەی دادەنێ و دەڕوا کەمێکی پێدەچێ منداڵەکە دەگری، ژنە بە هاوار و قیژەوە دەڵێ: ئای پیاوەکە ئەوە منداڵت بوو، پیاوەکە لە شەرمەزاریان گوند جێ دەهێڵێ ماڵ و سامان بۆ ژنە دەمینێتەوە دەڵێن چەندین ساڵی پێدەچێ کابرا دەڵێ: بابگەڕێمەوە ئێستا کەس لەیادی نەماوە کابرا دەگەڕێتەوە نێو گوند دەبینی دوو منداڵ گفتوگۆیانە هەریەکەی دەڵێ من گەورەترم یەکێکیان دەڵێ: تۆ کەی لە دایك بووی، ئەویش دەڵێ: ئەو ساڵەی فلان کەس منداڵەکەی بوو، کابرا دەڵێ: هێشتا منداڵ لەیادیانە واباشە بەیەکجاری بڕۆم و نەگەڕێمەوە.

---

* لە ژمارە/1/ی گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر بڵاوکراوەتەوە .

# دوو کەسی دوژمندار*

دەگێڕنـەوە، دوو پیـاوی بـاوك كوشـتەی یـەكتری هـەبوون، ئـەم دوو پیـاوە هــەردەم بــە دوای تۆڵــە ســەندنەوە لەیــەكتری دەگــەڕان تــاكو لەجێگایــەك بڕەخـسێ هەریەكـە و تۆڵـەی خـوێنی باوكـە كوژراوەكـەی بكاتـەوە، ڕۆژێك یـەكێكیان دەبینێ وا دوژمنەكـەی لـە دووری گونـدی بـە تـەنیاو رووت و قـوتی لـەناو گۆمـە ئاوێكـە و خـەریكی خۆشووشـتنە، دوژمنەكـەی لێـی نزیـك دەبێتـەوە و تڤەنگەكـەی لـێ سـوار دەكـات و پێـی دەڵـێ: زۆر لەمێــژە چـاوەڕوانی هــەڵێكی ئـەوهام تـا بتكـوژم و تۆڵـەی باوكمت لێ بكەمەوە هەر هێندەش ماوەت پێدەدەم تاكو دێیە دەرەوە و جلەكانت لەبەر دەكەیت، جا كابرای ناو ئاو هاتە دەرەوەو خەریكی لەبەر كردنـی جلـەكانی بـوو گـوتی: دەزانم ئێستا تـۆ بـە ئاسـانی دەتـوانی مـن بكوژی؟! بەڵام دڵنیابە، مەجالێكی لەوەش باشتر بۆ من ڕێككەوت تاكو بتكــوژم، بــابۆت بگێڕمــەوە، ڕۆژێــك زۆر بــەنهێنی هاتمــە حەوشــەی ماڵەكـەتان تـاكو بتكـوژم، منـیش ئـاوا تڤـەنگم لـێ سـوار كـردی بـەڵام كـە تەماشـام كـرد تـۆ زۆر نـەخۆش بـووی، لـەناو جێگـادا كـەوتبووی ژن و منداڵـەكانت لەچـواردەورتدا دانیـشتبوون و بـۆت دەگریـان، منـیش لـەم دەرفەتە باشەدا ویژدانم ڕێگای پێنەدام بتكوژم، بۆیە وازم لەم كارە هێنا و فیـشەكی بەرتڤەنگەكـەم دەرهێنـاو ڕۆیـشتم و بـەجێم هێـشتی، چـونكە ڕەحم و بەزەییم پێت داهاتەوە، كابرا كە گوێی لەم قسانەی دوژمنەكەی

---

* لە ڕۆژنامەی برایەتی ئەدەب و هونەر ژمارە/153/ ڕۆژی 1999/11/19 بڵاوكراوەتەوە .

بوو، چۆنی گوت، ئەوها بوو، بۆیە ئەویش تڤەنگەکەی فرێداو چوو بۆ لای، باوەشیان بەیەکتریدا کە هیچی تر دوژمنایەتی یەکتری نەکەن، لەوکاتەوە بوونە دوو برای دڵسۆز و باوەڕ پێکراوی یەکتری .

# غەدر بزر نابی*

دەگێڕنەوە سەردەمانی زوو، کوڕە گەنجێکی جوتیار، لەکاتی پشووی نیوەڕۆ لەسەر کانییەکی نزیک زەوییەکە خەریکی نان خواردن دەبێت، لەم کاتەدا سوار ئەسپێك دێتە لای، لەدوای سڵاو لەسەر ئەسپەکە دێتە خوارەوە و لەسەر کانیەکە دەم و چاوی دەشوات، لە دوورەوە چەند سوسکەیەك دەبینیٚ، پێدەکەنیٚ، کوڕەش دەڵیٚ((ئەوە بۆچی پێدەکەنی)) کابرا دەڵیٚ((بیست و پێنج ساڵ لەمەوبەر پیاوێکم لەسەر ئەم کانییە دامە بەرخەنجەر پیاوەکە لەڕوحدان بوو گوتی((سوسکە شایەدبن ئەو پیاوە منی کوشت)) کوڕە دوژمنی بۆ ئاشکرا دەبێت، بۆیە خەنجەری هەڵدەکێشیٚ و دەڵیٚ ئەو پیاوە باوکی من بوو یەکسەر ئەویش کابرای دەداتە بەرخەنجەران و دەیکوژێ .

* لە ڕۆژنامەی برایەتی ژمارە/2975/ ڕۆژی 1999/11/23 بڵاوکراوەتەوە .

# باوكم هەتا ئێرە هێنا بوو*

دەگێڕنــەوە ســەردەمانی زوو، پیاوێــك و ژنێــك، یــەك تاقــە كوڕیــان هەبوو، ژنـە دەمرێ و بـاوك و كوڕە بەیەكەوە دەمێننـەوە، پـاش ماوەیـەك باوكـە، ژن بـۆ كوڕەكـەی دەهـێنێ و بەیەكـەوە دەژیـن، دوای چـەند سـاڵێك باوكە بە ساڵ دەكەوێ و چیتر توانای كـاركردنی نابێت، كـوڕەش بـە ڕۆژ دەچێتە كاركردن و شەودەگەڕێتەوە، بـۆ ماوەیـەكی كـەم دوای ئـەمـە بوكـە زۆر خراپ دەبێ بۆ خەزوری، هەركە ئێواران كوڕە دەگەڕایەوە مـاڵ، بوكـە گەلـەك بۆڵـە بـۆڵی بەسـەر كوڕەكـەدا دەكـرد و دەیگـوت: باوكـت پیـسە و قسەم پێ دەڵێ و ... هتد .

كـوڕە نیـەتی خـراپ دەكەوێتـە دڵـی و بـیر لـەوە دەكاتـەوە باوكەكـەی بخاتــە زێیــێ، بۆیــە شــەوێك لــەنیوەی شــەودا باوكەكــەی لەســەر جــێ رادەكێشێ، كە نزیك زێیەكە دەبێتـەوە، باوكەكە دەڵـێ: كـوڕم هـەتا ئێـرە بەسە، چونكە منیش باوكم هەتا ئێرە هێنابوو، ئەم كـات كـوڕە موچڕكێك بەلەشیا دێ و بۆیـە باوكەكـەی دەهێنێتـەوە ماڵـەوە و خزمـەتی دەكـات تـا مردن .

---

* لە ڕۆژنامەی برایەتی ژمارە/2980/ ڕۆژی 1999/11/30 بڵاوكراوەتەوە .

# دووركەوتنەوەمان لەيەكتر باشترە*

دەگێڕنەوە لە سەردەمانی زوو شوانێكی شمشاڵ ژەن، ڕۆژەك لەبەر مەڕ لەسەر بەردێكا دانیشتبوو شمشاڵی دەژەنی، مارەك لە كونەكەی خۆیا دێتە دەر و دەست دەكا بە سەماكردن تاكو ماندوو دەبێت، پاشان لیرەیەك بە شوان دەدات و دەڵێ: هەموو ڕۆژێ وەك ئەمڕۆ شمشالم بۆ بژەنە منیش لیرەیەكت پێ دەدەم، بەم جۆرە لەگەڵ یەكدا ڕێك دەكەون، ماوەكی پێ دەچێت شوانە زۆر دەوڵەمەند دەبێت، دەچێ بۆ حەج و كوڕەكەی لەشوێن خۆی دادەنێ كوڕەش لەیەكەم چوون بیر لەوە دەكاتەوە هەر كە مارەكە هاتەدەر بەردەكی لێبداو بیكوژێ و شوێنەكەی هەڵكەنێ و گشت لیرەكان دەربهێنێ، بۆیە پاش شمشال لێدان كە مارەكە دێتەدەر، كوڕەكە بەردەكی بۆ دەهاوێژێ و بە كلكی دەكەوێ و قوتی دەكات، مار بەكلكی بڕاو دەچێتەوە كونەكەی خۆی، بۆ بەیانی دووبارە كوڕە دەچێتەوە لای كونی مارەكە، ئەمجارە ئاگاداری خۆی نابێ مارەكە پێوەی دەداو دەیكوژێ، ماوەیەكی پێدەچێ كابرا لە حەج دەگەڕێتەوە، بەسەرهاتی بۆ دەگێڕنەوە، كابرا كە زانی كوڕەكەی تاوانبارە، بۆیە گوێی پێ نادا و دەچێتەوە شوێنەكە و لەسەر بەردەكە دادەنیشێ و دەست دەكات بەشمشاڵ ژەنین، مارەكە سەر دەهێنێتە دەر و دەڵێ: چیتر نایەمەوە دەر بایەكتر نەبینین، كابرا هەر چەند دەڵێ: من هیچم لەدڵا نییە و كوڕەكەی من تاوانبار بووە، بەڵام مارەكە دەڵێ: من هەر چەند

---

* لە ڕۆژنامەی هاودەنگ ژمارە/6/ كانونی یەكەم 1999 بڵاوكراوەتەوە .

جاری کلکە بڕاوەکەی خۆم ببینم ڕق و کینەم هەڵدەستێ، تۆش هەر چەند جار بچیتە سەر قەبری کوڕەکەت ڕق و کینەت بەرامبەر بە من هەڵدەستێ، کەواتە دوور کەوتنەوەمان لەیەکتر باشترە .

# جێی کەسەر چاك نابێتەوە*

دەگێڕنەوە رۆژێك شێرێك لەگەڵ هاوڕێیەکی دەدوێ، لەناکاو هاوڕێیەکەی بەڕوو گرژییەوە پێی دەڵێت: دەمت دوورخەرەوە، تامی دەمت زۆر ناخۆشە، شێرەکە دەڵێ باشە، دەڕوا، خەنجەرێك دێنێ و دەیداتە دەست هاوڕێیەکەیی و پێی دەڵێ: خەنجەرێکم لێبدە، هاوڕێیەکەی زۆر لێی دەپارێتەوە و دەڵێ: چۆن دەبێ؟، شێرەکەش دەیترسێنێ، بۆیە، ناچار خەنجەرێك لە شێرەکە دەدات، شێر دەڕوا چەند ڕۆژێکی پێ دەچێت، برینەکەی چاك دەبێتەوە و دەگەرێتەوە لای هاوڕێیەکەیی و پێی دەڵێ: سەیری شوێنی برینەکە بکە ماوە، هاوڕێیەکەی دەڵێ: نەخێر شێر دەڵێ: جێی برین چاك دەبێتەوە، بەڵام جێگای قسە و کەسەر چاك نابێتەوە .

* لە ڕۆژنامەی برایەتی ژمارە/2990/ ڕۆژی 1999/12/14 بلاوکراوەتەوە.

# زمانی لەبنڕا دەرهێنا*

دەگێڕنەوە سەردەمانی زوو، منداڵێکی هەتیو لەگەڵ داپیرەی دەژیا، ڕۆژێ هێلکەیەك دەدزی و دەیهێنێتەوە ماڵێ، بە داپیرەی دەڵێ:ئەم هێلکەیەم دزیوە داپیرەی دەڵێ:چاکت کرد، بەم جۆرە منداڵی هان دەدا، تا وای لێهات بوو بە دزێکی نەقۆرا، چەند ساڵێکی پێ دەچێت دەگیرێت و فەرمانی لە سێدارە دانی بۆ دەردەچێت، کوڕە دەڵێ: پێش ئەوەی لەسێدارەم بدەن، یەك داپیرەم هەیە، پێم خۆشە بۆم بانگ بکەن و بیبینم، داپیرەی بۆ دەهێنن و کوڕە پێی دەڵێت: داپیرە دەوەرە پێش، داپیرەش لێی نزیك دەبێتەوە، دەڵێ دەزمانت دەربێنە، ئەویش زمانی دەردێنێ، کوڕە زمانی دەگرێ و لەبنڕا دەری دەهێنێ و پێی دەڵێ: بەم زمانە هانت نەدابام، ئاوام بەسەر نەدەهات .

---

* لە ڕۆژنامەی برایەتی ژمارە/3010/ ڕۆژی 2000/1/18 بڵاوکراوەتەوە .

# دەسکە پوش*

دەگێڕنەوە لەنێو کوردەواری مەڕدارێك کچە بێرییەکی جوانیان دەبی، کچە هەموو ڕۆژ دەچوو مەڕەکانی دەدۆشی و زوو دەگەڕایەوە، ماوەیەکی پێ دەچێ کچە لەگەڵ شوانەکەی دەکەونە داوی عەشق، بۆیە وای لێ دێ لەبەر باسی خۆشەویستی، کچە دڕەنگ دەگەڕێتەوە، باوکی هەست دەکات شتێك هەیە، بۆیە ڕۆژەك بەدزییەوە دەچێتە ئەو شوێنەی کە شوانە مەڕی لێ ڕادەگرێت، لەو شوێنەش بنەدار توویەکی گەورەی لێ دەبێت، دەچێتە سەر دارەکە خۆی حەشار دەدات، پاش ماوەیەك شوانە مەڕەکان دەهێنێتەوە بن دارەکە و کچەش دێت مەرەکان دەدۆشی و ئینجا دەکەونە باسی خۆشەویستی نێوان خۆیان، لەهیکرا کچە دەست بە دوعا دەکات کە بۆ یەك بن، شوانە سەر بەرەو ئاسمان بەرزدەکاتەوە و دەڵێ: ئامین، لەم کات باوکی دەبینێ و هەڵدێ، کچە بۆیە بەتوڕەیی دەسکە پوشکە هەڵدەگری و دەڵێ: قورش، قورش، باوکی کچەکەش دەڵێ کچم بۆ ئەو بەژنو باڵاو چاوە جوانانەی تۆ نەگرێتەوە، بۆ دەسکە پوش هەرناگەڕێتەوە .

* لە ڕۆژنامەی برایەتی ژمارە/3015/ ڕۆژی 2000/1/25 بڵاوکراوەتەوە .

# تاکە بڕکێك بە سەلامەتی دەرنەچوو*

دەگێڕنەوە لەسەردەمی کۆن لەنێو کوردەواری دا، ساڵێك کابرایەك بێستانی دێمی دەکات، هەر کە بیستانەکە شین دەبێت، کابرا سەرجەم بڕکەکان دەژمێرێ و ئینجا لەماڵەوە منداڵەکانی کۆدەکاتەوە و دەڵێ بێستانەکەمان ئەوەندە بڕکەیە، گەر هەر بڕکێکی ئەوەندە گندۆرە بگرێت و هەر گندۆرەیەکی چارەگە کیلۆیەك دەربچێت و هەر کیلویەك بەوەندە پارە بێت، ئەوەندە قازانج دەکەین، جا پێویستە کەپرێك لەنێو بێستانەکەدا دروست بکەین و ماڵمان بگوازینەوە ژێر کەپرەکەو بەهەمووومان ئاگاداری بین و خزمەتی بێستانەکە بکەین، ماڵ دەگوازنەوەو دەچنە ژێر کەپرەکە و چەند ڕۆژەێکی پێ دەچێت لەهیکڕا تۆز و بایەك هەڵدەکات و تاکە بڕکێك بەسەلامەتی دەرناچێت .

---

* لە ڕۆژنامەی برایەتی ژمارە/3377/ ڕۆژی 2001/5/8 بلاوکراوەتەوە .

# خەم لەوە ناخۆم درۆ دەکا*

دەگێڕنەوە لەنێو کوردەواری دا، لە گوندێك کابرایەك هەبوو، زۆر دەچووە دیوەخانی ئاغای گوند، دادەنیشت درۆی گەورەی دەکرد، دەڵێن ئاغا زۆر لێی بێزار دەبێت و ڕۆژێك کە ئەو لەویٚ نابێت، ئاغا ڕوو لە دانیشتوانی دیوەخان دەکات و دەڵێت: برایەنە ئەم جارەیان درۆ بکات بەسەرخۆی دادەشکێنمەوە و دەڵێم بەسیەتی وازبهێنە لە درۆکردن، دانیشتوەکانیش دەڵێن: ئاغا پێویست ناکاخۆت سەغڵەت بکەی، تازە فێر بووە و تەرکی ناکات دواتریش چ زیانێکی بۆت نییە و ئێمەش گەلێك پێی پێدەکەنین، خەم لەم کەسانە مەخۆ، ئاغاش دەڵیٚ: خەم لەوە ناخۆم کە درۆ دەکات، خەم لەوە دەخۆم کەوا دەزانیٚ بە درۆکانی بڕوا دەکەم .

# لەنێو چەوانت نووسراوە*

دەگێڕنەوە لەسەردەمی کۆن لەنێو کوردەواریدا شوانێك دەغڵیٚ جوتیارێك دەخوات، جوتیارەکە دەڵێتە شوانەکەی تۆ دەغڵی منت خواردووە، ئەویش دەڵیٚ: چۆن دەزانی؟ جوتیارەکە دەڵیٚ: لەنێو چەوانت نووسراوە، شوانەش دەستی بەتف دەکات و بەنێو چەوانی دادەنێت و کز دادەمێنیٚ .

---

* لە ڕۆژنامەی برایەتی ژمارە/3383/ ڕۆژی 2001/5/15 بڵاوکراوەتەوە .

* لە ڕۆژنامەی پاڵە ژمارە/72/ بڵاوکراوەتەوە .

# سەر بردەی مەلایەك*

دەگێڕنەوە لەسەردەمی کۆن، لەنێو کوردەواریدا مەلایەك تازە چوو بوو بۆ شارێك، ماوەی چەند مانگێك دەچووە سەر گۆڕی باوکی پاشای شارەکە قورئانی دەخوێند، کەس لێی نەپرسیی تا ڕۆژێك بەکوتکان کەوتە لێدانی گۆڕەکە، خەبەر دەگاتە پاشا، پاشاش ئەمر دەکات مەلای بانگ دەکات بۆ کۆشك، پاسەوان مەلای دەگرن و دەیبەنە بەردەمی پاشا، مەلاش سەربردەی خۆی دەگێڕێتەوە، پاشا ئاقڵمەند دەبێ و لەمەبەستی مەلا تێدەگات، بۆیە داوای لێبوردنی لێدەکا و خەڵاتیشی دەکات .

# نەکەی بڤەیە*

دەگێڕنەوە پیاوێکی بەتەمەن قەیرە کچێکی بەتەمەن دەخوازێ، لە پاش چەند ڕۆژەکی لە دانیشتنێکدا کابرا دەستی بۆ ئاگرێك دەبا، ژنەش دەڵێ: نەکەی بڤەیە کابراش دەڵێ: ژنەکە هەرچەندە بڵێی بڤەیە، بەخوای تەمەنمان ڕۆیی ناگەڕێتەوە و پیربووین .

---

* لە ڕۆژنامەی پاڵە ژمارە/72/ بڵاوکراوەتەوە .
* لە ڕۆژنامەی پاڵە ژمارە/71/ لە ڕۆژی 2002/11/25 بڵاوکراوەتەوە.

# بمره ئێره جێی هەقتە*

دەگێڕنـەوە لەسـەردەمی زوو لـە گوندێکـدا پۆلیـسەك کۆچـی دوایـی دەکات، خەڵکی گوند لاشـەکەی دەشـۆن و دەیبەنـە قەبرسـتان بـۆ ناشتن، ئەم گوندەش مەلای تیا نابێت تەنها کۆلکە خوێندەوارێك ئەویش دێت بۆ تەڵقین و تەنها ئەوەندەی لیٚ دەزانیٚ کە دەڵیٚ: ئـەی شـورتەی ئبن شـورتە لاقە مریشك ئەمرتە، بمره ئێره جێی هەقتە .

# عادەتی بوکان هەروایە*

دەگێڕنـەوە لەسـەردەمی کـۆن لـەنێو کوردەواریـدا ژنـەك چـوار مێـردی کردبوو، لە پێنجـەمین مێرکردنیـدا لـە ڕۆژی بوکێنیـدا کـە سـواری ئەسـپی دەکەن دەگریێ، دەڵێن ئەتوو لەپاش چوار مێرداندا بـۆ دەگریـێ، ئـەویش دەڵیٚ: عادەتی بۆکان هەروایە باتێك نەچی .

---

* لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر ژمارە/1/ بڵاوکراوەتەوە .

* لە ڕۆژنامەی پاڵە ژمارە/71/ بڵاوکراوەتەوە .

# یاسا لە من و لەویش گەورەترە*

دەگێڕنەوە، ڕۆژێ لە ڕۆژان هەیاس بەپێی یاسا حوکمی لە سێدارەدانی بۆ نزیکترین و خۆشەویسترین دۆستێکی خۆی دەرکرد، لەناو دادگا دەستی کرد بەگریان بۆی، پێیان گوت تۆ خۆت دادوەر و سەروەر بوویت دەتتوانی چۆنت بووێ حوکمت دابوایە، بۆچی بۆی دەگری؟ لەوەڵامدا وتی: من بۆ ئەوە دەگریم کە گیروگرفتی زەمانە بەم دەردەی برد و یاساش لەسەری کردم من بەو چاوە تەماشای بکەم، کە نەمدیووە و نایناسم، یاسا لەمن و لەویش گەورەترە .

# ئاهیان لە گەنمەکەی بڕی*

دەگێڕنەوە کابرایەك پارچە گەنمەك لە زورگێك دەچێنێت، زۆری پێناچێ سیخوڕ بە گەنمەکەی فێر دەبی، کیژوکاریش، بۆ کەنگر دەچوون ئەوانیش هەندێکی لێ دەفەوتێنن، ئەسپی ڕەواندانیش هەندەکی لێ دەفەوتێنن، ئینجا کابرا چی پێ نامینێ و دەڵێ: بە سیخوری و بە مەمك خڕی و بەسم خڕی، ئاهیان لە گەنمەکەی بڕی .

* بەناوی ڕاستگۆ لە ڕۆژنامەی برایەتی ژمارە/2242/ ڕۆژی 1996/12/26بڵاوکراوەتەوە.
* لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر ژمارە /1/ بڵاوکراوەتەوە .

# با خوا بیدات*

دەگێڕنەوە گەنجێك بەناوی عەلی كچێك دەخوازێ، دەڵێن لە یەكەم ڕۆژی زاوایەتی لەگەڵ بوك دەكەونە گفتوگۆكردن دەربارەی دوا ڕۆژی خۆیان هەروا دەڵێن: منداڵی نۆبەرەمان ناوی لێدەنێین فەرهاد هەر پێی گرت ئینجا لەگەڵ خۆمان دەیبەین بۆ سەیران و بە تایبەت بۆ لای فلان ڕووبار، لەهیكڕا یەكێكیان دەڵێ: ئەی گەر فەرهاد بكەوێتە نێو ڕووبارەكە خۆ دەخنكێ و دەمرێ و بەم وتەیە هەردووكیان دەگرین، بەدەنگێكی بەرز، دایكی زاوا گوێ بیست دەبێت لێیان دەچێتە ژوور و دەڵێ: كوڕم بۆ دەگری، كچم بۆ دەگری، ئەوانیش بەسەرهاتەكە دەگێڕنەوە، ئەویش دەڵێ: با خوا بیدات ئەو كات خوا كەریمە .

# وەكی خەڵكی بڵێ ئەنف*

لە كوردەواریدا دەگێڕنەوە مەلایەكی گن نەیدەتوانی بڵێ ئەلف دەیگوت: ئەنف، دەڵێن ڕۆژەك لە دەرس گوتنەوەی بە فەقێیەك، فەقێیەكەش لەدوای دەگوتەوە ئەنف، مەلا دەڵێ: وەكی من مەڵێ ئەنف وەكی خەڵكی بڵێ ئەنف .

* لە ژمارە/1/ی ئاسۆی فۆلكلۆر بڵاوكراوەتەوە .

* لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلكلۆر ژمارە /1/ بڵاوكراوەتەوە .

# زۆر مەخۆ زگت دێشی*

دەگێڕنـەوە ڕۆژێـك كابرایـەكی ئاشـەوان لـەكاتی نیـوەڕۆدا لـەپێش ئاشـەكەی خـەریكی خـواردنی خورما و ڕوون دەبێت، لـەم كات كابرایـەك باراشـی دەهێنیتـە ئاشـی بـەبێ پـرس و سـەلام كـردن یەكـسەر لەگـەڵ كابرای دەكەوێتە سەرخواردنی خورما و ڕوون، كابرای ئاشەوان گـەلێكی پێ ناخۆش دەبێ، بەڵام شەرم دەكات بڵێ لەگەڵم مـەخۆ، بۆیـە دەڵـێ: بـرا زۆری مـەخۆ زگت دێشی، كابراش دەڵـێ: بـەخوای هەرچـەند بخۆم زگـی تۆی زیاتر پێ دێشێ لە زگی من .

# ئاوم خوارد*

دەگێڕنـەوە لەسـەردەمی كـۆن لـەنێو كوردەواریـدا ڕۆژێك لـەدیوەخانی ئاغایـەك، خـەڵكێكی زۆری لێـدەبێت، ئاغـا ئـاو دەخـوات، دانیـشتوانی دیوەخان هەموویان دەڵێن عافییـەتت بێت، كابرایـەكی هـەژاریش لـەدوای ئاغاكـە ئـاو دەخـوات، بـەڵام كـەس نـاڵێ عافیـەتت بێـت، كـابرا ڕوو لەخەڵكەكە دەكات و دەڵێ ئەمنیش ئاوم خـوارد، ئـەوانیش دەڵێن چاكت كرد .

---

* لە ژمارە/1/ی گۆڤاری ئاسۆی فۆلكلۆر بڵاوكراوەتەوە .

* لە ڕۆژنامەی پاڵە ژمارە/73/ ڕۆژی 2003/2/5 بڵاوكراوەتەوە .

# ئای گوریێ چیت لێکردم*

دەگێڕنەوە لەسەردەمی کۆن لەنێو کوردەوارییدا، لەگوندێك ژنەك و پیاوەك هەبوون، ژنە بە ناوی گوریێ و پیاوەکەش ناوی محمود بوو، تاقە مانگایەکیان هەبوو پێی دەژیان، دەڵێ ڕۆژەك ژنە لەکاتی ماست فرۆشتن، لە شاری چاوی بە ژنە مەلایەك دەکەوێت، چەندین خولامی لەدوو دەڕوا، ئەم دیمەنە کار لە ژنەی دەکات، کە دەگەڕێتەوە دەڵێتە پیاوەکەی دەبێ ببی بە مەلا، پیاوەکەی دەڵێ: ژنەکە خوێندەوارییەکی وام نییە، چۆن ببم بە مەلا، ژنە واز ناهێنێت تا بە ناچاری مەحمود ڕوو لە شاری دەکا و مانگایەکە دەفرۆشی و کۆمەڵێك کتێبی پێ دەکڕی، ئەم هەموو کتێبە، دەبنین دەڵێن هەبێ و نەبێ مەلایەکی زۆر زیرەکە، بەخێرهاتنی گەرمی دەکەن و مەدح و سەنای بلاودەبێتەوە، ئەویش بەسەرەخۆی ناهێنێ، خەبەری زیرەکی مەلای تازە دەگاتە پاشای شار، بەرێکەوت ئەو شەوە چل دز ماڵی پاشایان بڕیوە، زێڕ و زیوەکی زۆریان بردووە، پاشاش دەڵێ: مادامەکێ مەلا هێندە زیرەك بێ چل شفتی بۆ مەلا دەنێرێ و دەڵێ: دەبێ هەتا چل ڕۆژی تر ئەو دزیەم بۆ ئاشکرا بکات، مەلاش دەڵێ: باشە، هەتا چل ڕۆژیش خوا کەریمە، دەڵێن، دزەکانیش گوێ بیستی ناوبانگی ئەو مەلایە دەبن، بۆیە یەکێك لە دزەکان بەشەو دەچێتە بەر دەرگای ماڵی مەلا و خۆی حەشار دەدات و دەڵێ: بزانم مەلا چ دەڵێ، دەڵێ لەم کات مەلا دەڵێ گوریێ شفتیەکی بێنە، ئەوە لەچلان یەك هات، دزەکە یەکسەر دڵی ڕادەتەکێ و دەڵێ: بەخوای ئاشکرای کردین، ڕۆژی دووەم دزێکی تر دەچێ، هەم دیسان مەلا دەڵێ: شفتیەکی تر بهێنە، ئەوە لە چلان دوو هات، بەم جۆرە

* لە ڕۆژنامەی برایەتی ژمارە/3418/ ڕۆژی 2001/6/26 بلاوکراوەتەوە .

چەند ڕۆژێك دزەكان یەك لە دوای دەچن، دواتر هەموو بەیەكجار ڕوو لە ماڵی مەلای دەكەن و دەڵێن، بەس ئاشكرامان مەكە، هەموو زێڕ و زیوەكان دەهێنینەوە، مەلا دەڵێ، باشە، دزەكان زێڕ و زیوەكان دەگەڕێننەوە، پاش تەواو بوونی چل ڕۆژەكە مەلا زێڕ و زیوەكان دەگەڕێنێتەوە دەست پاشای، پاشاش زۆر كەیف خۆش دەبێ و قەسرێكی لە تەنیشت خۆی بۆ مەلا دروست دەكات و دەڵێن زێیەك لەنیو شارەكە هەبوو مەلایەكی زۆر زیرەك لەوبەری زێیەكە دەبێ، پاشا مەلا مەحمودی لەگەڵ ئەو مەلا زیرەكەی تاقی دەكاتەوە، بزانن كامیان زیرەكترن، مەلایەكان خۆ ئامادە دەكەن، یەك لەم بەر، یەك لەوبەر هەریەكە و كۆمەڵێك خەڵك لێیان كۆدەبنەوە، مەلا زیرەكەكە چەند پرسیارێك بە ئیشارەت لەمەلا مەحمود دەكات، مەلا مەحمودیش سەرجەمیان بەهەڵە وەڵام دەداتەوە، بەڵام مەلای زیرەك وا دەزانێ ڕاستە، بۆیە مەلا مەحمود بە زیرەكتر دەردەچێ، پاشا زێتر دڵخۆش دەبێ و زێتر یارمەتی مەلا دەدات، ماوەیەكی دیكەی پێ دەچێت ڕۆژێك جەژن دەبێت، پاشا بەخۆیی و وەزیرەكانی و خەڵكێكی زۆر دەچنە ماڵی مەلای، پاشا لەباخچەكەی گوڵێك لێدەكاتەوە و لەناو لەپی دەستی دەنێت و دەڵێتە وەزیرەكان و خەڵكەكەی لەمەلای دەپرسم ئەوە چییە لەناو لەپم، ئەگەر زانی خەڵاتێكی گەلەك باشی دەكەم، ئەگەر نەیزانی لەپێش ئێوە لەسەری دەدەم، لەژووری مەلای نزیك دەبنەوە و مەلا و مەلاژن بە پیریانەوە دێن، پاشا ڕوو لەمەلا دەكات و دەڵێ: مەلا ئەوە چییە لەناولەپم، ئەگەر زانیت لەسەر دەستی ئەوانە خەڵاتێكی زۆر باشت دەكەم، ئەگەر نەتزانی شەرتبێ هەر ئێستا لەسەرت دەدەم، مەلاش سەرێك بادەدا و ڕوو لە گوڕێ دەكات و دەڵێ: ئای گوڕێ چت لێكردم، پاشاش دەڵێ: ئەرێوەڵڵا ئەوەتا گوڕە .

# له بیرته*

دەگێڕنـەوە لـەنێو کوردەواریـدا کابرایـەك هـەبوو خـودا نیعمـەتێکی باشی پێ بەخشیبوو، بەڵام کابرا لـەخۆبایی ببـوو، ڕۆژێك لـە مەجلسێك دانیشتبوو کابرایەکی ڕیش سپی ئاقڵمەند چەند ساڵێك لەپێش ئەو کات گەلێك ئیشی سەپانی و جوتیاری و شوانیان بەیەکەوە کردبوو، لـەوکات ڕوو لـەکابرای لـەخۆبایی دەکـات و دەڵـێ: ئـەرێ لەبیرتـە گـەلێك ئیـشی سـەپانی و شـوانی و جوتیاریمـان بەیەکـەوە کـردووە، کـابرا دەڵـێ: بـەڵێ خێـرە وا دەڵێـی، کـابرای ڕیـش سـپی دەڵـێ: دە باشـە هـەر مەبەسـتم ئەوەندە بوو .

# با هەندێك جوێن بە یەك بدەین*

لە نێو کوردەوارییدا دەگێڕنەوە لە گوندێکدا دوو کـەس ڕقیـان لـەیەك دەبۆوە، دەڵێن ڕۆژێکیان لە دیوەخانی گوندەکە دەبن، یەکێکیان لـەهیکڕا هەڵدەسـتێ و هەڵدەکوتێتـە سـەر ئـەویتر لێـی بـدات، ئـەویش بـەبێ خـۆ مشەوەش کردن دەڵێ: دانیشەوە با سەرەتا هەندێك جوێن بەیەك بدەین.

---

* لە ڕۆژنامەی پاڵە ژمارە /70/بلاوکراوەتەوە .

* لە ڕۆژنامەی پاڵە ژمارە/70/ بلاوکراوەتەوە .

# فریام کەون قوربانە*

دەگێڕنەوە لە سەردەمی کۆن، ئاشەوانێك هەبوو، بە ڕۆژ ئاشەوان بوو بە شەویش پاسەوانی ئاشەکە بوو، دەڵێن شەوێك سێ دز دەمامکی خۆیان بە تەنی ڕەش دەکەن و دەڕۆن باراشەکانی ئاشەکە لە ئاشەوانەکە بدزن، هەرکە دەگەنە لای ئاشەکە ئاشەوان دەگرن و دەست و پێی دەبەستن و دەڵێن هەتا ئێمە کاری خۆمان دەکەین و دەڕۆین، قسە نەکەی، کابرای ئاشەوانیش دەزانێ کارێ وان دزینی باراشی ئاشەکەیە، هەر چەندە دەڵێ: بابتان چاك، داکتان چاك وازبێنن هەر سوودی نابێ، ئەوجارە ئاشەوان ڕێگایەکی تر دەدۆزێتەوە بۆ ئەوەی خۆی ڕزگار بکات، دەڵێ: مادامەکێ دوو دەقان دەست و پێم بکەنەوە، چونکە ئێوارە قەولم بە مەلا دابوو، لەجیاتی ئەو بانگ بدەم/ مەلا نەخۆشە، دزەکان بەم داواکارییە ڕازی دەبن و دەست و پێی دەکەنەوە، ئاشەوان دەچێتە سەر بانی و دەست لە بناگوێی دەنێت و دەگرێی و دەڵێ:

ئەلسەلات سێ دانە
ئەگەر دەنگکەم کوتانە
دەنگ نەکەم ئاش بڕانە
فریام کەون قوربانە
ئینجا خەڵکەکە بەهانای دەگەن و ڕزگاری دەکەن

* لە ڕۆژنامەی برایەتی ئەدەب و هونەر ژمارە/246/ هەینی 2001/9/28 بڵاوکراوەتەوە .

# فیڵی خەسوو*

دەگێڕنەوە لە سەردەمی کۆن لەنێو کوردەواریدا پیرە ژنێك سێ بوکی دەبێ، بووکەکان زۆر لەگەڵی خراپ دەبن، پیرەژن نەخۆش دەکەوێت، هیچ لە بوکان بە تەکیشیدا نە دەهاتن پیرەژن بیر دەکاتەوە و دەڵێ، فێڵێك نەدۆزمەوە بوکەکان دەمکوژن لەبرسان، پیرەژن چەند پەڕە کاغەزێك پەیدا دەکات و دەیخاتە ناو سەرینەکەی ئینجا بەنهێنی بەهەر یەکێکیان دەڵێ: پارەیەکی باشم لەنێو سەرینەکەدا هەیە، دوای مردنم و گەردەن ئازابوون بۆ خۆت بێت، لەبەر ئەوەی خزمەتێکی باشم دەکەی، هەریەك لەبووکەکان بڕوایان دێت، خزمەتێکی وای دەکەن نەگوترێ، تا ئەو ڕۆژەی پیرەژن ئەمری خودا بەجێ دەهێنێ و دەمرێ، بوکەکان هەر یەك لەلای خۆی بە دڵخۆشی، دەچنە لای سەرینەکەی تا بۆ خۆیان بیبەن، ئەو دەیگوت بەمنی بەخشیوە، ئەویتر دەیگوت بەمنی بەخشیوە، لێیان دەبێتە شەڕ و سەرینەکە لە ڕاکێشانی بەردەستیان، پارچە، پارچە دەبێت و پەڕە کاغەزی لێ دێتە دەرێ، هەر یەك لە بوکەکان لە شوێنی خۆیان دڵ سارد دەبن، ئەنجامی فێڵی پیرەژن بۆ یەکتر دەگێڕنەوە و بە پەشیمانیەوە دەڵێن خوایە ئێمە نەبینە خاوەن بوکی وا ...!

---

* لە ڕۆژنامەی برایەتی ئەدەب و هونەر ژمارە/243/ هەینی 2001/9/7 بڵاوکراوەتەوە .

# کەر تەلاقی نییە*

دەگێڕنـەوە لـەنێو کـوردەواری لەسـەردەمی کـۆن لەگوندێکدا کابرایـەك کــوێر دەبێــت، بــەم کوێریــەی دەچــێتە گونــدەکانی دەوروپــشتی گوندەکـەیان، خـەڵکی گوندەکـە زۆر لـەلایان سـەیر دەبێـت چـۆن بـەم کوێریـەی دەچـێتە ئـەو هـەموو گونـدە بـەبێ ئـەوەی لـەڕێگا لابـدات و بکەوێتە کەندێك، بۆیـە پیاوانی گوندەکە ئەوانیش تـەلاق دەخـۆن بەچاو نوقانـدن بـچنە گونـدێك وەك ئـەو کـوێرە، دەڵـێن سـەرجەمیان چـاویان دەنوقێنن و دەڕۆن و لەڕێگا دەکەونە نێو کەندێك و نابێ کەسیش چاوی هـەڵبێنێ، چـونکە گـەر چـاویان هـەڵبێنن تـەلاقییان دەکـەوێ، دەڵـێن لەوکاتەدا کوێرەکە لـە گوندەکە دەگەڕێتـەوە و گوێی لـەدەنگی پیاوەکـان دەبێت دەچێتە لایان و دەڵێ:

ئێوە کێن، ئەوانیش سەربردەی خۆیان دەگێڕنەوە، جا بە کوێرەکە دەڵێن بڕۆ بانگی مەلا بکە چارەیەکمان بۆ بدۆزێتەوە، چونکە چاومان هەڵبێنین تەلاقمان دەکەوێ، کوێرەش دەچێتەوە گوندەکە و سەبردەی پیاوەکان بۆ مەلا دەگێڕێتەوە، مەلا دەچێ بە پیاوەکان دەڵێ: چاوتان هەڵێنن و ئینجا بە زەڕین وەك گوێ درێـژ بـەرەو گوندەکە بگەڕێنـەوە، بـەم جـۆرە تـەلاقتان چا دەبێـت، چـونکە ئەگـەر لەکـەر، کـەرتر نـەبن واناکـەن کـەریش تـەلاقی نییە.

---

* لە ڕۆژنامەی پاڵە ژمارە/73/ ڕۆژی 2003/2/5 بڵاوکراوەتەوە .

# گیا لەسەر پنجی خۆی دەڕوێتەوە*

دەگێڕنەوە لەسەردەمی کۆندا پاشای شارێك سێ ساڵ لەسەر یەك کچیان دەبوو، ماڵە هەژارێکیش جیرانیان بوو سێ ساڵ لەسەر یەك کوڕیان دەبوو، بۆ ساڵی چوارەم پاشا بە ژنەکەی گوت بڕۆ بەم ژنە بڵێ گەر ئەم ساڵ کوڕی بوو، ئێمەش کچ با لەگەڵمان بگۆڕیتەوە خەلاتێکی باشی دەکەم، گەر وا نەکەی دەبێ ژنەکی تر بێنم، ژنە پاشاش لەترسان بەژنە جیرانەکەیان دەڵێ و ئەویش ڕازی دەبێت، بۆ چوارەم جار ژنە پاشا کچی دەبێ و ژنە هەژارەکەش کوڕ بە دزی منداڵەکان دەگۆڕنەوە، دەڵێن چەند ساڵێکی پێدەچێ، کە گەورە دەبن، پاشا هەر چەند هەوڵ دەدات کە کوڕەکە هیچ کارێك نەکات، بەلام بێ سوود دەبێ ڕۆژانە هەر خەریکی کاروکاسبی دەبێ، بۆیە پاشا بە ژنەکەی دەڵێ، دەبڕۆ ماڵە هەژارەکەش بزانە کچەکە چی دەکات، ژنەکە دەچێ سەیری کچەکە دەکات دەبینی هەر خەریکی خۆ ڕازاندنەوەیە، کە ژنە پاشا دەگەڕێتەوە ماڵ سەربردەکە بۆ پاشا دەگێڕێتەوە ئەویش دەڵێ: گیا لەسەر پنجی خۆی دەڕوێتەوە .

---

* لە ڕۆژنامەی پالە ژمارە/74/ ڕۆژی 2003/2/26 بلاوکراوەتەوە .

# مێرووی شین*

دەگێڕنەوە لەسەردەمی کۆن لەنێو کوردەواریدا کابرایەك لەگوندێکدا، دوو ژنی هەبوو، بۆ ئەوەی خۆی خۆشەویست بکات لەلایان بەنهێنی هەریەکە و مێروویەکی شینی دابوو بە ژنەکان، هەروەها لەلای هەریەکەیان وتبووی تۆم خۆش دەوێ بۆیە ئەم مێرووە شینەم بەتۆ بەخشیوە، بەڵام لەلای کەس باسی مەکە ئەوانیش هەریەکەی بەدڵخۆشییەوە وتیان باشە بەڵێن بێ لای کەس باسی نەکەم، دەڵێن زۆرجار لەنێو مەجلیس لەکابرایان دەپرسی کامە ژنت خۆشتر دەوێ، کابراش دەیگوت ئەوەی مێرووە شینەکەم پێ بەخشیوە، ژنەکانیش دڵخۆش دەبوون، چونکە هەریەکەی لای خۆیەوە بەخۆی تێدەگەیشت .

# ئاگر و ڕوو ناگا بەشوو*

دەگێڕنەوە لە سەردەمی زوو لەنێو کوردەواریدا، ڕۆژەك لە وەرزی زستاندا خوشکەك و برایەك بە پێیان بەرەو گوندەك دەچن، لەڕێگادا بەفرەکی زۆریان لێدەباریێ، خوشکەکە زۆر سەرمای دەبی، برایەکەی ئاگر دەکاتەوە بۆ خۆ گەرم کردنەوەیان، خوشکەکەی دەڵێ ئاگر و ڕوو ناگا بەشوو، بەم قسەیە زۆر تووڕە دەبی، بۆیە دەڵێ: خوشکم دیارە زۆر حەزت لە شووە، خوشکەکەی دەڵێ: برام لە مەبەستم نەگەیشتی، گەر شووم بکردایە و لەگەڵ مێردەکەی خۆم بوومایە، بە ئارەزووی خۆم جلەکانم لە بەرامبەری لەبەر دەکردەوە و خۆم وشك دەکردەوە .

---

* لە ڕۆژنامەی پاڵە ژمارە/73/ ڕۆژی 2003/2/5 بڵاوکراوەتەوە .

* لە ڕۆژنامەی پاڵە ژمارە/79/ ڕۆژی 2004/2/25 بڵاوکراوەتەوە .

# پەشیمانی*

دەگێڕنەوە لەسەردەمی کۆن لەنێو کوردەواریدا ساڵێك لە وەرزی زستاندا بەفرێکی زۆر دەکەوێت، چەندین گیانلەبەری کێوی ڕوو لە گوندەکان دەکەن، یەکێك لەو گوندانە کە سەیری ئەو گیانلەبەرانە دەکات زۆر لەلایان جوان و سەرنج ڕاکێش دەبێ، بۆیە زۆر لە مەڕ و ماڵاتەکەی خۆیان سەر دەبڕن و دەیخۆن، دەڵێن ئەم گیانلەبەرانە بەخێو دەکەین، بەم جۆرە بەخێویان دەکەن تا ئەو کاتەی بەفر نامێنێت، ئینجا شوانەکان دەست دەدەنە گۆپاڵ و گیانلەبەرەکان ڕادەدەن بەرەو لەوەڕ، بەڵام هەرکە لەگوند دوور کەوتنەوە هەریەکە و بەرەو لایەك ڕای کرد، شوانەکان هەر چەندە هەوڵیاندا هیچیان بۆ نەگیراوە ناچار بە خۆیان و گۆپاڵەوە بەرەو گوند گەڕانەوە و بەسەرهاتی ڕۆیشتنی گیانلەبەرەکانیان گێڕایەوە، ئینجا خەڵکی گوندی بیریان کردەوە ئەوەندە مەڕ و ماڵاتەی خۆیان ماوە خزمەتێکی باشیان بکەن تاوەکو زۆر ببنەوە .

* لە ڕۆژنامەی پاڵە ژمارە/73/ ڕۆژی 2005/2/5 بڵاوکراوەتەوە .

# به خۆی ئیشی خۆی دەزانیٚ*

دەگێڕنەوە لەسەردەمی کۆن لەنێو کوردەواریدا، لە گوندێکدا دایکێك و کوڕە گەنجێك بەیەکەوە دەژیان، دایکە داوا لە کوڕە دەکات ژن بێنیٚ، کوڕەش دەڵیٚ دایە ژن بەچی بێنم، بە خۆت دەزانی کەم دەرامەتین، دایکەش دەڵیٚ کوڕم مادامەکی ژن بە ژنەك ببینەوە خۆم ژنت بۆ دەکەم، کوڕەش ڕازی دەبێت و دەچێتە لای خزمانی ژن بە ژنێکی بۆ بدۆزنەوە، زۆربەی خزمەکانیش نا ڕازی دەبن و دێنە لای دایکی و دەڵێن چۆن دەبیٚ تۆ بە ژن بدات، دایکی کوڕەش دەڵیٚ: کوڕەکەم بە خۆی ئیشی خۆی دەزانیٚ .

# هۆی خویٚ*

دەگێڕنەوە لەسەردەمی کۆن لەنێو کوردەوارییدا، عارەبێکی خورما فرۆش لە گوندێکی نێو کوردەوارییدا لەجیاتی بانگی خورما بکات، بەدەنگێکی بەرز دەریٚ هۆی خویٚ، بەمەبەستی خویٚ کڕین خەڵك دەچنە لای، بەڵام دەبینن خویٚی لا نییە، بەڵکو خورمای لەلایە، دەرێن تۆ خورمات لەلایە بۆچی بانگی خویٚ دەکەی، عارەبەکەش دەریٚ لەترسی مێشان، بەڵکو وا دەزانن خوێم لەلایە نەوەك خورما .

---

* لە ڕۆژنامەی پاڵە ژمارە/73/ ڕۆژی 2005/2/5 بڵاوکراوەتەوە .

* لە ڕۆژنامەی پاڵە ژمارە/83/ ڕۆژی 2004/6/26 بڵاوکراوەتەوە .

# بۆڵە بۆڵی پیاوەك*

دەگێڕنەوە لەسەردەمی کۆن لەنێو کوردەواریدا، ژنەك و پیاوەك دەبن، پیاوەکە هەردەم بۆڵە بۆڵی لەسەر ژنەکە دەکرد، چونکە لەدەرەوە ژنی ڕازاوەی دەبینی، ژنەکەی ئەویش لەبەر ئەوەی کەم دەرامەت بوون، نەیدەتوانی جل و بەرگی جوان و نوێ لەبەر بکات، ناچار ئافرەتەکە گوتی: دەبێ فێڵەك بدۆزمەوە، ڕۆژێك بە جل و بەرگی ناسیاوێك خۆی جوان دەڕازێنێتەوە و دەچێتە بازار، شانێك لە شانی پیاوەکەی خۆی دەدات، پیاوەکەش دەڵێ: چیت دەوێ، ژنە دەڵێ: حەز دەکەم شوو بە توو بکەم، ماڵم لەفلاّن شوێنە و ئەمشەو لەفلاّن کات وەرە بۆ لام کابرا دەڵێ: باشە، کەمێکی تر دەڕوات شانی لە شانی مەلایەك دەدات، مەلا دەڵێ خێرە، ژنە دەڵێ: حەز دەکەم شوو بەتوو بکەم ئەمشەو لەفلان کات وەرە فلاّن شوێن، کاتەکە کەمێك دوای ئەوەی پێشووتر دادەنێت، مەلاش دەڵێ:باشە، ماوەیەکی تر ژنەکە دەڕوات و بەهەمان جۆری پێشوو، شان لە شانی پیاوەکی تر دەدات و کاتەکی کەمێ دوای ئەوەی تر بۆ ئەویش دادەنێ، ژنە شەو دەچێتە شوێنەکە و پیاوەکەی دێت کەمێك لەگەڵی دادەنیشێ، مەلا لە دەرگا دەدات، ژنە دەڵێ: ئەوە پیاوەکەمە لە دەرگا دەدات بەیەکەوە بمانبینێ هەردووکمان دەکوژێ، پیاوەکەی دەڵێ: چم لێدەکەی، ژنە دەڵێ: وەرە نێو ئەم کانتۆرە، پیاوەکە دەچێتە نێو کانتۆرەکە، ژنە دەرگای لە مەلاکە دەکاتەوە و کەمێك بەیەکەوە

---

* لە ڕۆژنامەی پاڵە ژمارە/74/ ڕۆژی 2005/2/26 بلاّوکراوەتەوە .

دادەنیشن، دیسان لە دەرگا دەدرێ ژنە دەڵێ: بە خوای ئەوە پیاوەکەمە بەیەکەوە بمانبینێ، هەردووکمان دەکوژێ، مەلا دەڵێ: چم لێدەکەی، ژنە دەڵێ: وەرە ناوەندی ژوور شتێکت پێدا دەدەم و چراکەت لەسەر سەری دادەنێم، مەلاش ڕازی دەبێت، ژنە دەچێ دەرگا دەکاتەوە، کابرا دێتە ژوور و کەمێك دادەنیشێ، ژنە بەفێڵێك دەڕوا دەچێتەوە ماڵێ خۆی دەگۆڕێ هەندەی پێناچێ مەلا ملی شل دەبێت و چراکەی لەسەر سەر بەردەبێتەوە و دەکوژێتەوە، ژوور دەبێتە تاریکە شەو، کابرا و مەلا و پیاوەکەی بەگژیەکدا دەچن و دەبێتە شەڕێکی گەرم لەنێوانیاندا و هەموو دەم و چاوی یەکتر دەکەنە خوێن، ئینجا پەرتەی لێدەکەن، پیاوی ژنەکەش بەدەم و چاوی بەخوێنەوە دەگەڕێتەوە ماڵەوە ژنەکەشی لێی دەپرسێ پیاوەکە بۆ وات لێهاتووە، کابراش بەسەرهاتی خۆی بۆ دەگێڕێتەوە .

# ژنە مەلا*

دەگێڕنەوە لە سەردەمی کۆن لەنێو کوردەوارییدا، ڕۆژەك ژنە جۆرا و ژنە مەلا دەچنە کۆڕێ، ژنە جۆرا لەسەرەوەی ژنە مەلا مەنجەری ئاوی دەخاتە سەر ئاگر بۆ گەرم کردن، ژنە مەلا غاری دەداتێ و مەنجەرە ئاوە گەرمەکەی لێ بە گۆڕێ وەردەکا، دەرێ ئەوە بۆ ئاوەکەت لێڕشتم، ئەویش دەرێ ئەمن ژنە مەلام کو دەبی ئەتوو لەسەرەوەی من کۆڕێ بکەی، ژنە جۆرا شمەکی خۆی خڕدەکاتەوە و دەچێتە مارێ و دەرێتە پیاوەکەی، یان دەبیە مەلا، یان دەبی تەلاقم بدەی، پیاوەکە هەر چەندی دەڵێ بابت چاك ئەمن جۆرامە کو دەبێ، دەڵێ نابێ، ناچار جۆرا بار دەکات و دەچیتە شارەك، هەندێك ڕەژوو دەست دەداتێ لەگەڵ چەند پارچە کاغەزەك، ژن دەوری لێدەدەن و دەڵێن مەلا دوعامان بۆ بکە مەلاش پارچە ڕەژوو بەسەر پارچە کاغەزەکە دادەنیت و دەڵێ ئەوە دوعایە بەتەمای خوای، دەڵێن ژنەك چەند ساڵ بوو منداڵی نەدەبوو دەچیتە لای مەلا، مەلاش دوعای بۆ دەکا و دەڵێ بەتەمای خوای، ژنە زگی دەبێ و بەم جۆرە مەلا زێتر ناوبانگی دەردەکا، دواتر چەند ڕۆژەك ئەنگوستیلەی ماڵی پاشای کارەکەرەکەیان دەیدزێ ماڵی پاشا بانگی مەلای دەکەن تاوەکو بۆیان بدۆزێتەوە، کارەکەرەکە بەمە دەزانی خۆی دەگەینتە مەلا و دەڵێ دەیهێنمەوە بەس ناوم مەدە، مەلاش دەڵێت قازەکم بۆ بێنە و لەبەر چاوم ئەنگوستیلەکە بخە بەردەمی تاوەکو قوتی

---

* لە ڕۆژنامەی پاڵە ژمارە/74/ ڕۆژی 2005/2/26 بڵاوکراوەتەوە .

دەدا، کارەکەرەکـەش قـازەکی دەیـنی و دەیخاتــە بـەر دەمـی و قازەکـە ئەنگوســتیلەکە قـوت دەدا، ئینجـا مــەلا خەبــەر دەداتــە مـاڵی پاشـا و ئــەوانیش دێــن و مــەلا دەڵــێ: ئــەو قــازە ئەنگوســتیلەکەی قوتدایــە، ئەوانیش قازەکـەی سـەر دەبڕن و قسەی مـەلا ڕاسـت دەردەچـێ دەڵـێن: مــەلای شـار خڕدەبنــەوە و دەچـنەلای پاشـا و دەڵـێن ئــەوە مــەلا نییــە، پاشاش دەڵـێ: باشـە ئـەمن شـتەك دەشـارمەوە ئەگـەر ئێـوە زانیتـان ئـەوە مــەلان و ئــەو مــەلا نییــە، ئەگــەر نــەتان زانــی و ئــەو زانــی کەواتــە ئێـوە مەلانینـە و ئـەو مەلایـە، دەبڕۆن لـە کۆشـك بـانگی ئـەویش بکـەن تـاوەکو شتەکە دەشارمەوە، مەلایەکان دەچنە دەرەوە و ئەو مـەلاش دێـت و پاشـا لەژوورەوە گوڵەك لەبن نوێنی خۆی دەشارتەوە، دواتـر مەلایـەکان دێنـەوە ژوور هەریەکەی لـە وەڵامـدا هەریـەکـەی شتەك دەڵـێن، لـە پاشـان کـە سـرە دەگاتە مەلایەکە، مەلاش ژنەکەی ناوی گوڵێ دەبێ بۆیـە لەخـەمان دەڵـێ: ئـای گـوڵێ چیت لێکـردم، پاشـاش دەڵـێ: ئـەرێ وەڵـڵا ئەوەتـە گوڵـە بـەم جۆرە دەباتەوە، ئەو جارەیان مەلاکان دەڵێن دەباشە با غودبەیەکی بدات، ڕۆژی هـەینی دێـت و کـات دەگاتـە غودبـە مـەلا دەچـێتە سـەر مینبـەر و هەرچەند دەکا هیچ نازانی بۆیە لەخەمان لـەهیکرا بـەڕاکردن ڕدێـنی پاشـا دەگــرێ و ڕای دەتــەکێنێ و دەچــتە دەرەوەی مزگــەوت، لــەو کاتــەدا مزگەوت بەسەریەکدا دەڕمێ، دوای ئەوە بەیەك جار پاشا بـاوەڕی پێـدێت کە مەلایەکی زۆر زیرەك و لێزانە بۆیە دەڵێ ماشاڵڵا هەر وەلییە .

# چۆن دڵت دێت*

دەگێڕنەوە لە سەردەمی زوو لەنێو کوردەواریدا، لە ڕۆژێکی سەرمای زستان لە گوندێکدا پیاوێك دەچێتە سەر خانوو، تا هەندێك باگوردان بگێڕێ تاوەکو خانووەکە دڵۆپەی نەکات،پیاوە بەو سەرمایە زۆر دەمینێتەوە دایکەکەی لەژوورەوە لانکەی کوڕزاکەی دەهەژێنێ، لەبەر ئەوەی کوڕەکەی زۆر دەمێنێتەوە بەو سەرمایە دایکەکەش چەند بانگی دەکات بێتە خوارەوە سەرمایە دڵی بۆ دەسوتا، ئەویش هەر دەڵێ وادێم بەڵام نایەتە خوارەوە، بۆیە دایکەکەی لانکەکەی دەهێنێتە دەرەوە، کوڕە کە لانکەکەی دەبینی هاوار دەکات و دەڵێ دایە چۆن دڵت دێت ئەم منداڵە بهێنیە دەرەوە نازانی جەرگی منە، دایکەکەش دەرێ ئەی تۆش جەرگی من نیت هەر هاوار دەکەم نایتە خوارەوە .

---

* لە ڕۆژنامەی پاڵە ژمارە/79/ ڕۆژی 2004/2/25 بڵاوکراوەتەوە .

# پاش تەگە*

دەگێڕنـەوە لەسـەردەمی کـۆن لـەنێو کـوردەواری لەگوندێکـدا ژنـەك و پیاوێك تاقە کوڕێکیان هەبوو پیشەی شوان بـوو، لەبەر تاقانەیی زۆریـان خۆش دەویست هەر کەبووە لاو ژنیـان بـۆ هێنـا، دایکـەی هەسـتی پێکـرد کوڕە کەم دەچووە لای ژنەی بۆیە ڕۆژێك لەبوکەی پرسی، ئەویش گوتی: بـەڵێ زۆر کـەم ئـاوێزانی یـەکتری دەبین، دایکـی کـوڕەی گوتیـە بوکەکـەی خەم مـەخۆ فێڵێکـی وا دەبینمـەوە هـەر زوو زوو کـاری سێکسیت لەگەڵدا بکـات، بۆیــە ڕۆژێـك کـە کوڕەکـەی بـەیانی مـەڕی ڕادا، گۆتیــە بوکـەی چاوەکانت بەکل ڕەش بکە، بوکەکەش چاوەکانی بەکل ڕەش کرد، ئێـوارە کوڕە کە گەڕایەوە ماڵـەوە ژنەکەی وابینی زۆر لای سـەیر بـوو، دایکـی بـە کوڕەکەی گـوت: کـوڕم ئـەوە پـاش تەگـەی کردۆتـەوە، ئینجـا شـەو چـووە لایـی و کـاری سێکسی کـرد، بـۆ بـەیانی بەهـەمان شـێوە چاوەکانی بـەکل ڕەش کـرد، کـوڕە دیـسان کـە گەڕایـەوە سـەیری چاوەکانی ژنەکـەی کـرد گـوتی: ئـۆی دیـسان پـاش تەگـەی کردۆتـەوە، بـەم جـۆرە زۆربـەی ڕۆژان بوکەکە چاوەکانی پڕ کل دەکرد .

* لە ڕۆژنامەی پاڵە ژمارە/88/ ڕۆژی 2004/12/7 بڵاوکراوەتەوە .

# هەرچی بکەم پێم دەکریٚ*

دەگێڕنەوە لە سەردەمی کۆن لەنێو کوردەوارییدا لە گوندێك کابرایەك دەریٚ بوویمە پیاو چاکێك هەرچی حەز بکەم پێم دەکریٚ: حەزم لێبی ئەو گوندەی وێران دەکەم، چ ماڵەکی دونیام بوویٚ بۆم دەبیٚ، بەم قسانە گرفت دەکەوێتە نێو خەڵك، بۆیە ئاغای گوند بێزار دەبیٚ، ناچار ڕۆژێك بانگی کابرای دەکا و سەرجەم خەڵکی گوند کۆدەکاتەوە، دەیانباتە لای گردێك ئینجا بە کابرا دەڵیٚ: وەرە بەو گردەی بڵیٚ بڕوا، ئەگەر ڕۆیی دەتکەم بە گەورەی گوند، گەر نەڕۆیی دەربەدەرت دەکەم، کابرا دەریٚ باشە، بە دەنگێکی بەرز هاوار دەکات ئەی گرد بڕۆ، (ئیٚ گرد چۆن دەڕوا) بۆ جاری دووەم دەریٚ ئەی گرد بڕۆ، خەڵکەکەش هەر تەماشای گردەکە دەکەن لەجێی خۆیەتی، بۆ جاری سێیەم دەریٚ ئەی گرد بڕۆ ئەگەر نا ئەمن دەڕۆم.

---

* لە ڕۆژنامەی پاڵە ژمارە/83/ ڕۆژی 2004/6/26 بڵاوکراوەتەوە .

# کوڕی من بێ دەبێ بمرێ*

جاران لەنێو کوردەوارییدا ڕێزگرتن و شەرم لەنێو گەورە و بچووك و باوك و کوڕ و دایك و خزم و کەس باوبوو، بۆیە دەگێڕنەوە لەنێو کوردەواری لە دیوەخانی گوندێکدا، شەوێك مێوانێکی زۆری لێدەبێت، ئاغا بەخۆیی و کوڕەکانیشی لەوێ دەبن، یەکێك لە کوڕەکانی ئاغا بەهۆی نەخۆشی ئاگاداری خۆی نابێت، لەدانیشتنەکە بایەکی لێدێتە دەرێ، لەبەر ئەوەی لەنێو کوردەواری بەعەیب دەچێ و خەڵك پێکەنینیان دێت و خۆشی بەخۆیدا دەشکێتەوە، بۆیە ئاغا کە گوێی لەدەنگی دەبێ و سەیری دەکات و دەرێ گەر کوڕی من بێ دەبێ بمرێ، بۆیە دەرێن چەند دەقیقەیەکی پێدەچێت کوڕە لەخەمان دەمرێت .

---

* لە ڕۆژنامەی پاڵە ژمارە/83/ ڕۆژی 2004/6/26 بلاّوکراوەتەوە .

# خودا کەیفی خۆیەتی*

جاران لە کوردەواری سەید و مەلا و شێخ بەتایبەتی زۆر ڕێزیان لێدەگیرا و هەموو باوەڕێکیان پێی بوو بە تایبەت دوعا، واتە پاڕانەوە لە خوای گەورە، بۆیە دەرێن لەمانگێکی ڕەمەزان کابرایەك لەکاتی پارشێو بەئاگا نایەت، کە لەخەو هەڵدەستێ کاتی نان خواردن نەماوە، جارانیش بڕوایان وابوو ئەو ڕۆژەیان لەکیس دەچێ و نابێ بەڕۆژوبن، کابرا زۆر خەم دەخوا، بۆ چارەی وای بەباش دەزانێ قەندە شەکرەکی دەکڕێ و دەچێتە دیوەخانی شێخی گوندەکە و دوای کەمێك دانیشتن قەندە شەکرەکەی دەردەهێنێ و لەپێش شێخی دادەنێ، ئینجا دەرێ بەو خودایەی ئیمانم پێی هەیە درۆی ناکەم، پارشێو بە ئاگا نەهاتم وەکی بەئاگا هاتم ڕۆژهەڵات بوو بۆیە ئەو ڕۆژەم چوو دەبێ عافوم بکەی، شێخیش بەخەندەیەکی نەرم و لەسەرەخۆ دەرێ ئەوە من عافوم کردی خوداش کەیفی خۆیەتی، کابراش دەرێ گەلەك مەمنوونم خودا بەڕوحمە گرنگ ئەوەیە ئەتو عافوم بکەی .

---

* لە ڕۆژنامەی پاڵە ژمارە/83/ ڕۆژی 2004/6/26 بڵاوکراوەتەوە .

# دەست بدە دار بکوژە مار*

دەگێرنەوە ڕۆژێك کابرایەك بە ناوی مام ئۆمەر بە سواری ئەسپێك بەرە و گوندێك دەچێ، لەڕێگا تووشی پەرێزێك دەبی دەسوتێ، لەناو پەرێزەکە مارێکی تێدا دەبێت، مام ئۆمەر ڕمێکی پێ دەبێ، هەر لەسەر پشتی ئەسپەکە بۆ ڕزگار بوونی مارەکە ڕمەکەی بۆ مارەکە شۆڕ دەکاتەوە، مارەش بە ڕمەکەدا، هەڵدەگەرێ و دەکەوێتە سەرشانی مام ئۆمەر، بەم جۆرە مارەکەی ڕزگار دەکات، بەڵام کە لە ئاگرەکە دوور دەکەونەوە، مارەکە لەملی مام ئۆمەر دەئاڵێ و دەرێ بە کێندەرەت وە دەم، مام ئۆمەر دەرێ، من چاکەم لەگەل کردی لە ئاگرم ڕزگار کردی، مار دەرێ شتی وا نییە، مام ئۆمەر دەرێ: با بەشەرع بکەین، مارەکە دەرێ باشە، لە ڕێگا تووشی گایەك دەبن مام ئۆمەر دەرێ وەرە شەرعمان بۆ بکە، من ئەو مارەم لەناو ئاگر ڕزگار کرد، ئێستاش دەرێ بە کێندەرت وەبدەم، گا دەرێ مادام کابرا تۆ هێندە بێ ئەقلی ئەو مارەت ڕزگار کرد هەقە پێتەوەبدا و بتکوژێ مام ئۆمەر دەرێ، بەم شەرعە ڕازی نیم دەڕۆم ئەم جارە تووشی ڕێوییەك دەبن مام ئۆمەر دەرێ وەرە شەرعمان بۆ بکە من ئەو مارەم لەناو ئاگر ڕزگار کردووە، ئێستاش دەرێ بەکێندەرت وەبدەم، ڕێوی دەرێ شەرع وا نابێ تۆ ئەم ڕمە فرێ بدەیی و لێی دوور بی ماریش بچێتە ناو فەردە و سەری توند گرێ بدرێ نەوەك بە شەرعەکەم ڕازی نەبن، دەستم لێوەشێنن، ئەوانیش ڕازی دەبن بەم جۆرە وا دەکەن ئینجا مام ڕێوی دەرێ لە باب و باپیرم هەر وام بیستووە، دەست بدە دار بکوژە مار، بەم جۆرە مام ئۆمەر دەست دەداتە دار مارەکە دەکوژێ و لە دەستی قوتار دەبێ .

---

* لە ڕۆژنامەی پاڵە ژمارە/78/ ڕۆژی 2004/1/30 بڵاوکراوەتەوە .

# کاسەی بە تاڵ*

دەگێڕنـەوە لـە سـەردەمی کـۆن لـەنێو کوردەواریـدا لـە گونـدێك ژن و مێردێك زۆر نەدار و هەژار بوون، زۆربەی بژێوی ژیانیان لەسـەر زەکات و سەرفترەی خەڵکی گوند بوو کە پێیان دەبەخشرا، ئێوارەیـەك بـە یەکـەوە دانیشتبوون، پیاوەکە گوتی: وەڵڵاهی دەبێ خـەرجی بکـەی شـتومەکمان نییە، ئەوەبوو ناوی گەلێك کەلوپەلی زەروورەتی ماڵەوەی هێنا کە ئـەوان نەیانبوو، پیاوەکەش سوێندی خوارد یەك فلس خەرج ناکات، لـە ئـەنجام بـووە شـەڕیان پیاوەکـە دەسـتی دایـە بەرچیخەك و لێدە و بکوتـە کەوتـە گیـانی ژنەکـەیی و باشـی لێـدەدات، لـەم کاتـەدا بـاوکی ژنەکـە بەسـەر شەڕەکەدا دێت و لە یەکیان دەکاتەوە، دەپرسـێ لەبـەر چـی شـەڕ دەکـەن؟ زاواکـەی سـەربردەکە دەگێڕێتـەوە، بـاوکی ژنەکـە دەڵێتـە زاواکـەی ئێـوە لەسەر پارەیەك شەڕتانە کە هێشتا لە گیرفانی خەڵك دایە، جارێ با بێتـە دەستتان ئەوجا شەڕ بکەن لەسەری!!.

---

* لە گۆڤاری ڕۆناهی ژمارە/40/ ڕۆژی 2005/12/1 بڵاوکراوەتەوە .

# پاشایەکی قۆچ هاتوو*

دەگێڕنەوە لەسەردەمی کۆن، پاشایەك هەبوو دوو قۆچی لێهاتبوو، کەس نەیدەزانی، هەر جارەی سەری بە یەکێك بتراشیایە لە سەری کابرای دەدا، لەبەر ئەوەی نەوەك قۆچهاتنەکەی ئاشکرا بکات ئەو کات لەنێو خەڵك شەرمەزار دەبیٚ و ڕێز و تەقدیری ناگیریٚ، دەڵێن یەکێك لە دواجار ە سەری دەتراشیٚ، دەیەویٚ لەسەری بدات، کابرا زۆری لێدەپاڕێتەوە لەسەری نەدات بەو بەڵێنەی لەلای کەس باس لە قۆچ هاتنەکەی نەکات و هەموو جارێکیش ئەو سەرەکەی بتراشیٚ، پاشا ڕەزامەند دەبیٚ، ماوەی چەند ساڵێکی پێدەچێت، کابرا نەخۆش دەکەوێت، پاشا چەندین دکتۆر و حەکیمی دونیای پێدەکات چارەسەری نابێت، تا ڕۆژێك کابرایەکی ئاقڵمەند دەڵێن ئەو نەخۆشیەی ئەوەیە کە شتێکی لە دڵییە و نایڵیٚ، بۆیە بە کابرای نەخۆش دەڵیٚ گەر دەتەویٚ لە نەخۆشیەکەت ڕزگار بیت چیت لە دڵە بیڵیٚ، گەر بە ئاشکرا نایڵێی و نهێنیە بڕۆ لەنێو حەوزێك، یا ڕووبارێك سەری خۆت بخە نێو ئاوەکە و ئەو کات ئەوەی لە دڵتە بیڵیٚ، کابرای نەخۆش تێدەگا و بەتەنیا دەچێت سەری خۆی دەخاتە نێو حەوزی پاشایەکە و دەڵیٚ: پاشا دوو قۆچی هەیە، بەم جۆرە نەخۆشیەکەی نامێنیٚ .

---

* لە گۆڤاری ڕۆناهی ژمارە/43/ ڕۆژی 2006/3/8 بڵاوکراوەتەوە .

# نان*

دەگێڕنەوە لە سەردەمی کۆن لەنێو کوردەواریدا، ڕۆژێك گەنجێك بەرەو سەفەرێکی دوور بەڕێ دەکەوێت، لەبەر ئەوەی ڕێگایەکی دوور و درێژە هەندێك نان لەنێو جۆرکێك دەکات و دەیخاتە ناو باخەڵی و دوعا بوون لە باوك و دایکی دەخوازێ، باوکەکەی پێی دەڵێ: کورم ئامۆژگاریەکت بکەم، کەی نانەکەت بوو بە حەلوا ئەو کات بیخۆ، کوڕەش دەڵێ: باشە باوکە.

کوڕە دەڕوات و برسی دەبێت، جۆرکە نان دەردێنێ و دەیکاتەوە، دەبینی هەر نانە و نەبۆتە حەلوا، بۆیە جۆرکەکە دەخاتەوە باخەڵی، ماوەیەکی دیکە دەڕوا، جۆرکەکە دەردێنێ و دەیکاتەوە، دەبینی هەر نانە و هەم دیسان دەیخاتەوە باخەڵێ، ماوەیەکی زۆری دیکە دەڕوات برسیەتی تینی بۆ دێنێ و زۆر هیلاکی دەکات، جۆرکەکە دەردێنێ و سەیر دەکات هەر نانەکەیە و نەبۆتە حەلوا، ئەمجارە دەڵێ: خۆ باوکم چوزانێ نانەکە نەبۆتە حەلوا دەیخۆم و کە لێی پرسیم دەڵێم بوو بە حەلوا، لەوێ لێی دادەنیشێ و نانەکە دەخوات و دوای پشوویەك ئینجا بەڕێ دەکەوێت و دەگاتە شوێنی مەبەست و دوای بە ئەنجام گەیاندنی کارەکەی دەگەڕێتەوە ماڵەوە، باوکی لێی دەپرسێ نانەکە بوو بە حەلوا ئینجا خواردت، کوڕە دەڵێ: نەوەڵڵا باوکە، بەڵام زۆر برسیم بوو بۆیە خواردم، بەڵام بەخوا لە حەلوا خۆشتر بوو، باوکەش پێدەکەنێ و دەڵێ: منیش بەم جۆرەم دەویست.

---

* لە گۆڤاری ڕۆناهی ژمارە/44/ بڵاوکراوەتەوە .

# دوو فەقێی چاوکز*

دەگێڕنەوە چەندین ساڵ لەمەوبەر دوو فەقێی برادەری یەکتر چاویان کزبووە، یەکێکیان بۆ دوور، ئەوی دیکە بۆ نزیك، بۆیە بەیەکەوە دەچنە لای دکتۆرێك چاوێلکەیان بۆ دروست بکات، کە چاویان فەحس دەکات، ئەوەی بۆ نزیك کزە بۆ هەر پیتێکی پێی دەڵێ ڕووی لە کام لایە، دەڵێ: نابینم تا دەگاتە لە هەمووان گەورەتر ئینجا دەڵێ: ئەمانە دەبینم، دکتۆرەکە، پێی دەڵێ: هەر سوپاسی خوای دەوێ تەواو کوێر نەبووی کە بەم جۆرە چاوت کزە، چۆن تا ئێستا نەهاتووی، بەگوێرەی فەحسەکە چاویلکە بۆ هەر یەکیان دروست دەکات، لە چاوییان دەکەن و چەند شەقاوێك دەڕۆن ئەوەی چاوی کزە لە نزیك بەوی دیکە دەڵێ ئەوە چییە سەرم ژان دەکات و چاوم نابینی وەختە کوێر بم دەستم بگرە با نەکەوم ئەویش دەڵێ: دیارە فەحسەکەی غەڵەت کردووە با بەگەڕێینەوە لای دکتۆر، یان چاوت زۆر کزە پیتەکانت نەبینی؟ ئەویش دەڵێ بەڕێوەڵڵا هەموو پیتەکانم دەدیت و دەمزانی ڕووی لە کام لایە، بەڵام لە ترسی نەوەك ڕاستی بڵێم چاویلکەم بۆ دروست نەکات گوتم نابینم، ئێ برام چاویشم کز بووە دەرسم باش بۆ ناخوێندرێتەوە.

---

* لە گۆڤاری ڕۆناهی ژمارە/45/ بلاوکراوەتەوە .

## سوپاس بۆ:

- ئەنستیوتی کەلەپوری کوردستان .
- مامۆستا کەریم شارەزا .
- سەرجەم هاورێیانم لە بەرنامەی ڕەوسەی فۆلکلۆر کە بۆ ماوەی حەوت ساڵی ڕەبەق، لە ڕۆژی 1998/4/16 تا 2005/4/15 لە ڕادیۆی هەرێم لە ئامادە کردن و پێشکەش کردنی بەندەتان پێشکەش کرا .
- بۆ خێزانی ماڵەوەم .

# ناوەڕۆك

# زنجیره کتێبی ئینستوتی کەلەپوری کوردستان

| زنجیره | ناوی کتێب | ناوی نووسەر | ساڵی چاپ |
|---|---|---|---|
| 1) | بەرکوتێکی مەتەڵی فۆلکلۆری کوردی | سەدرەدین نورەدین ئەبوبەکر | 2005 |
| 2) | دەروازەیەک بۆ بۆتەکانی موزیک | غەمگین فەرەج | 2005 |
| 3) | وەرز و ساڵنامەی میللی لەپەند و شیعری کوریدا | پ . د شوکریە رەسول | 2005 |
| 4) | لەبارەی کۆکردنەوەی موزیکی میللیدا بە زمانی(کوردی عەرەبی) | مود کار بلیس و ئەرنولد باکیە. اعداد:د.محمد زازا و. تاریق ساڵح | 2005 |
| 5) | چلاواز 1 | وریا ئەحمەد | 2006 |
| 6) | پەندی کوردی: چیرۆکەکەی | عومەر شێخەڵڵا دەشتەکی | 2006 |
| 7) | هێلکەی نامێ کۆمەڵێك ئەفسانە و حیکایەتی جۆرا و جۆری فۆلکلۆریی نێو کوردەوارییە بەرگی یەکەم/ بەشی یەکەم | مەولود ئیبراهیم حەسەن | 2006 |
| 8) | هێلکەی نامێ کۆمەڵێك ئەفسانە و حیکایەتی جۆرا و جۆری فۆلکلۆریی نێو کوردەوارییە بەرگی یەکەم/ بەشی دووەم | مەولود ئیبراهیم حەسەن | 2006 |
| 9) | خصائص أغاني الأطفال في کوردستان العراق | گۆنا قادر | 2006 |
| 10) | پەندو قسەی نەستەقی ماچۆ | هەردەوێڵ کاکەیی | 2006 |
| 11 | سەربردەی کوردەواری | جەمال گردەسۆری | 2006 |